ناوی کتێب: مەولەوی (لێکۆڵینەوە، پشکنین، شیعری بڵاونەکراوە).
نووسەر: حەکیم مەلا ساڵح
بڵاوکەرەوە: ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی
ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی
تیراژ: ۳۰۰۰
چاپی یەکەم: ساڵی ۱۳۷۶ی هەتاوی

# پێرست

ناونیشان | لاپەرە

## ـ پێشەکی یەکی کورت ـ

مەولەوی هەرچەندە گلەیی مێژووی ئەو سەردەمەی هێناوەتە سەر خۆی و ، هەرچەندە شیعرەکانی هەر حیکایەت لە ژیانی چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵ ئەکەنو ، هەرچەندە موناسەبەتی شیعرەکانی نرخێکی ئەوتۆی کۆمەڵایەتی یان نیەو چاوی لە دەیان و سەدان کێشەو گرفتی خەڵک نوقاندوە. کەچی هێشتا هەر ئەبێ لە ڕیزی پێشەوەی شاعیرە بە دەستەڵات و توانا دارەکانی ڕابوردی ئەدەبەکەمانی دابنێین . چونکە بە ڕاستی بە خەیاڵی ناسک و دەست و پەنجەی هونەری یەوە کارێکی کردووە کە نمونەی زۆر کەمەو مەگەر نالی لە شیعری ڕابوردوماندا توانیبێتی ئاوا هونەر بە لوتکە بگەیەنێ .

لە باسی مەولەویدا بەر لە هەموو کەسێ پێویستە پەنجەی ڕێز بۆ زانای هێژا مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس درێژ بکرێت ، کە هەندێ لە تەمەنی خۆی بەخشی و تەرخانکردبۆ بوژاندنەوە و لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانی ئەم شاعیرەمان ، هەر لە نامەکانیەوە هەتا چوار شاکارەکەی ، کە بەوەش پەنجەرەیەکی گەورەی لە ڕووی دڵدارانی ئەدەبی کوردی و مەولەویدا ئاوەڵا کرد .

ئەگەر ئەومامۆستا بەڕێزە نەبوایە کێ ئەیتوانی بەتایبەتی خۆی بدات لە قەرەی ( الفضیلة ) و ( الفوائح )ەکەی . بە لێکدانەوەی واژەو لێکۆڵینەوەی بەیتەکانی دیوانی قەسیدەو غەزەلەکانیشی هەزارانی وەک ئێمەو مانانی هۆشیار کردەوەو مینبەری شیعری پڕلە هونەرو ڕەسەنی خۆمانی پێ نیشاندایین .

ئەگەر ئەو کارەی ئەوان نەبوایەکەی ئێمە ئەوەندە عاشقی مەولەوی ئەبووین و ؟ کەی ئێمەئەوەندە مەولەویمان ئەناسی ؟

منیش ئەو عەشقە باڵی پێوە نامکە لە شاری سنەدا ئەمماڵەو ئەوماڵ و لەهەوورامان و ساراڵ و دەوروبەری سنەدا ئەم دێ و ئەو دێ بکەم و بەدوای

بەیتێکی ڕۆشنایی نەدیویدا ماندوو نەبم . تا بەڵکو مەڵۆیەکم بێ بە دەستەوەو بیخەمە سەر خەرمانی ئەدەبەکەی . کاتێ بە یەکجاری کەوتمەنێوە ڕاستیباخچەکەی شاعیرەوە و بۆنی گوڵانسەرمەستیان کردم ، بینیم بەسەر لقی شاگوڵێکەوە بولبولێ بەکوڵ ئەچریکێنێ ، منیش شیعرەکانی مەولەوی فێریان کردبووم کە لەزمانی پونەوەرەکانی سروشت حاڵی ببم . بۆیە کە بە پەرۆشەوە گوێم بۆدەنگە سیحراویەکەی هەڵخست .. تێ گەشتم پێم ئەڵێ : من ڕۆحی مەولەویم .. ڕۆڵە گیان ، کارهەرلەوەدا نیە تۆ خۆت هەلداویتەبنی دەریاو سەدەف بدۆزیتەوەو لەدوو توێی سەدەفەکانداگەوهەرە ونبوەکانی من بە دەستبێنی .. ئەتوانی لەگەڵ ئەوەدا کاری تریشم بۆ بکەیت .

لەمە ئەوە تێ گەشتم کەئەبێ هەندێ قسە بخەمە پاڵ قسەی بە نرخی ئەوانەی کە لێکۆڵینەوەیان لە سەر لایەنەکانی ژیان و هونەری مەولەوی کردووەو هەم بە وردی دیوانەکەی بپشکنم .

جا خوێنەری خۆشەویست : ئەم بەرهەمەی لە بەردەستدایە بەری ڕەنجی شەش ساڵ تەقالایە و هیوادارم ئێوەش و ڕۆحی هەمیشە ئامادەی مەولەویش لێی ڕازی بن و منیش بەمکارەم توانیبێتم خزمەتێکی گچکەم پێشکەش بە کاروانی ئەدەبەکەمان کردبێ .

هەربژین

حەکیم مەلا سالح ١٩٩٦/٣/١

# باری ژیانی مەولەوی

لەبارەی چۆنیەتی ژیانی مەولەوی‌یەوە هەندێ جار واخراوەتە بەرچاو کە هەژارو کەم‌دەست بووە. بەتایبەتی بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس زیاتر پێ‌ی لە سەر ئەوەداگرتوە. لە لاپەڕە (ک)ی پێشەکی دیوانی مەولەویدا نوسیویانە : باری ژیانی ئابوری‌ی مەولەوی زۆرناخۆش بووە، بەڵام ئەوڕازی بووە بەو ژیانە، وە زۆربەی وەختی خۆی بە شێوەی دەروێشی ڕابواردوە.

پاشان لە زاری حاجی شێخ مستەفای هەولێری‌یەوە پێمان ئەگەیەنێ کە مەولەوی لە نان و دۆ بەولاوە هیچی‌تری نەبووە و بگرە نان و دۆباشترین خواردنی بووە.

لەگەڵ ڕێزم‌دا بۆمامۆستای پایەبەرز، من ئەمەوێ لەم گۆشەیەوە هەندێ شت بدرکێنم کە ئەوەڕەت بکەنەوە مەولەوی هەژارو نەدار بووە.

١ ـ مەولەوی جگە لەوەی کوڕەمەلا بوەو بەنانی مەلایەتی ژیانێکی مام ناوەندییان بە سەر بردووە، لەناوچەی تاوگۆزیش‌دا ماڵ و موڵکیان هەبووە کە ژیانیان لە سەری ڕۆشتوە بەڕێوە.

٢ ـ مەولەوی کاتێ کە گەورە بووەوپێگەشتوە، واتە لە سنوری ژیانی ماڵی باوکی دەرچووە، ئیتر خۆی بە هۆی زانست و بەهرەکەیەوە بۆتە هاو خوانی شێخەکانی هەورامان و پاشاکانی جاف و والیەکانی ئەردەڵان و پاشاکانی بابان کە لەو ڕۆژگارەدا ئەمانە گەورەترین دەستەڵاتی مەزهەبی و سیاسی‌یان بووە، لەگەڵ‌ئەم‌دەستەڵاتەش‌دا هەریەکە بەنیازی خۆیان مەولەویان لاواندۆتەوەو ڕێزیان لەکەسایەتیە زانستی ـ ئەدەبیەکەی گرتوە. جا کەسێک ئەم چینانە نیازیان پێ‌ی‌هەبێ چۆن‌دێڵن هەژاری ڕووی تێ بکات و بەنەداری بژی ؟.

٣ـ مەولەوی مەلایەکی ڕۆشنبیر بووەو عەوامانە بیری نەکردۆتەوە. بۆیە کە

ڕێگای حەجی گرتۆتە بەر ، واتە لەباری ژیانی زیاتری هەبووە ،ئەگەر ژیانی هەر نان ودۆ خواردن بوایە چۆن ئەیتوانی حەج هەڵبژێرێ ؟

۴ ـ لە شیعری (۱۹ )ی پیتی ( دال )دا شێخ عەزیزی جانەوەرە داوای پارەی لێ ئەکات . ئەم شیعرە کاتێ وتراوە کە هەردووکیان فەقێ بوون و ئەو ڕۆژانە بووە کەمەولەوی بە هۆی خوێندنەوە ماوەیەک سنە بە جێ دێڵێ و ئەچێتە بانە.

ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەلەفەقێیەتیشدا مەولەوی هەربوویەتی و باخەڵی گەرم بووە.

۵ ـ مەولەوی ئەوەندەی هەبووە کەژیانی کۆمەڵێک لە خزمەکانیشی مسۆگەر کردوەو ئیدارەی کردوون .

کاک ڕەئوف عوسمان لە بەشە عەرەبیەکەی گۆڤاری کاروان ژمارە ( ۱۳ )دا چەند بەڵگە نامەیەکی میری میرانی بڵاو کردۆتەوە کە یەکێک لەو بەڵگەنامانە وای دیاری ئەکەن کە مەولەوی سیانزە خێزانی لەگەڵدا بوون و ژیانی دابین کردوون. ـ کەپاشان بەڵگە نامەکان ئەخەینە ڕوو ـ.

ئەمانەی کە باسمانکردن چەند بەڵگەیەک بوون لەسەر ئەوەی کە مەولەوی نەک هەر هەژار نەبووە ، بەڵکو دارا بووەو ژیانێکی خۆش و ئاسودەشی هەبووە .

وە لە ناوشیعرەکانیشیدا خەمی نەبوونیو نەداری دیار نیە ، مەولەوی شاعیری موناسەباتە ، ئەگەر هەژاری وبرسێتی کسپەیان لەجەرگی هەڵساندایەئەوابە موناسەبەتی ڕۆژێکی تاڵی ژیانیەوە چەند بەیتێکی بۆ ئەوتین.

من لەم بەڵگانەدا نەمویستوە نرخی مەولەوی لە دارا و نەداراییدا دیاری بکەم ، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە ڕۆشنایی بخەمە سەرباری ژیانی و یەکێکم لەو کەسانەی کە پێم خۆشە مەولەوی بەژیان و شیعرەکانیەوە بە باشی ساخ بکرێتەوە ، چونکەبەیەکێ لە گەورەترین مایەی شانازی ئەدەبەکەمانی ئەزانم و بەپێویستی

سەرشانی خۆمی ئەزانم کە هەرچی بۆم بکرێ لە وەختی خۆمدابنێم بۆ ئەممەبەستە پیرۆزە.

## ـ بەڵگە نامەی یەکەم ـ

علی ویس با برادرانش ، محمد ویس ، سان‌احمد ، درویش ، سلیم با برادرانش ، محمد ، قادر،علی‌ویس ، عزیز با برادرانش ، کیانی ، شاویس،سلیمان .

عالیشأن معلی مکان ، ارادت و صداقت نشان ، خالوی محمد بیگ سلمه‌الله تعالی بعد ازسلام مشهود میدارد که درینوقت بقرار پیشتر سیزده باب خانواران مرقومین فوق را بآدمیت جناب مستغنی الالقاب مولوی قرارداد و آنها راباو واگذار نمودیم و خرج وحواله‌جات آنها را بکلی از دفترخانه اخراج کردیم ، دربیان تأکید بشما اظهار واشعار مینماید البته من بعد بهیچ وجه من‌الوجوه علاقة و رجوعی بآنها نداشته‌ومزاحم حال و متعرض‌احوال‌آنهانشده . فارغ البال وآسوده حال‌بوده‌باشند .بآمر آدمیت معزوالیه قیام و اقدام نمایند. کوتاهی جایز نداشته (ودر عهده‌است ).

٢٣ جمادی ١٢٦١

عبدالله

میرمیران

واتە: عەلی وەیس لەگەڵ براکانیا . محەممەد وەیس ، سان ئەحمەد ، دەروێش سەلیم لەگەڵ براکانیا . محەممەد ، قادر ، عەلی وەیس . عەزیزلەگەڵ براکانیا . کەیانی ، شاوەیس ، سلێمان .

خاوەن شکۆی پایەدار ، دۆستی ڕاستی نیشان ، خاڵۆمحەممەد بەگ سەلامی خوای لێ بێ . دوای سڵاوێکی شایانلەمکاتەداکە بە پێی بڕیاری پێشوتر سیانزە

**خێزانی ناوبراو لەسەرەوە کە دەست و پێوەندی ئاوازە بەرز مەولەوین و سەرپەرشتی کەری ئەوانە و خەرج و حەواڵەگەلیانمان بە گشتی لە دەفتەرخانە نەهێشتوە ، لەمبارەوە پێتان ڕائەگەیەنین و ئاگادارتان ئەکەین کە بە هیچ شێوەیەک هەقتان بە سەریانەوە نەبێت و حاڵیان مەگرن و هیچ کارێکتان بەسەریانەوە نەبێت . دڵنەواییان بکەن و ئاسودەیان کەن . وە بەفەرمانی ئەو بەڕێزە ( واتە مەولەوی ) لەگەڵیان بجوڵێنەوە . کەم وکوڕی مەکەن و لە زامن دان .**

## - بەڵگەنامەی دووەم -

خویش واقاربان جناب عالیجناب اخوی مولوی ( بدانند ) البته بورود رقیمۀ عالی ، باکمال امنیت و خاطر جمعی . با خانه وکوچ برخواسته ، بشهرزور اقامت نمایند ، و در هرمواد فارغ البال بکسب وکار خود مشغول شده ، و آسوده حال بدعای بقای دولت عالی پردازند . ودراینخصوص خاطر را جمع دارند ، حسب‌المقرر عمل نمایند ( ودر عهده‌است ) .

۹ ب ۱۲۶۴

عبدالله

میرمیران

**واتە** : دۆستان و خزمانی جەنابی پایەبەرز مەولەوی برام . بزانن ئەڵبەتە بەگەشتنی نامەی سەرەوە ، بەو پەڕی ئاسایش و دڵنیایی‌یەوە بەرەوشارەزوورکۆچ بکەن ، لە هەموو کاتێکابەئاسودەیی سەرگەرمی کارو کاسپی خۆتان بن . وە بەئاسودەیی نزا بۆمانەوەی دەوڵەتی هێژا بکەن . لەمڕووەوە دڵنیا بن و بە پێی‌بڕیار هەڵس وکەوت بکەن . لە زامن‌دان .

## - بەڵگە نامەی سێ یەم -

**حکم عالی**

آنکه چون ( .... ) موجب رضای حضرت‌کبریا وباعث خوشنودی سیدانبیاء علیه‌الصلوة‌والثناء است . بنابراین بحمدالله‌الملک‌المنان و بناباُستحقاق ذاتی قریهٔ بیاوله را بعنوان وقفیت بجناب عالی جناب مقدس القاب اخوی مولوی مولانا عبدالرحیم تفویض نمودیم که مداخل آنرا گرفته صرف مدار گزار خود سازد. و بفراغت بالی بأمر تدریس ونشرعلوم و عبادت ودعاگوی مقام عالی پردازد . البته احدی دخل در آن نکند . ( وقد عهد ) .

۲۱ ج ۱۲۶۱

عبدالله

میرمیران

**واته :**

ئەوە چونکە مایەی ڕەزای حەزرەتی کبریاومایەی خۆشحاڵیی گەورەی پێغەمبەرانە درودی لە سەربێ . بەم‌پێ‌یەو بە سوپاسی خوداوە وبە پێی مافی تایبەتی خۆم گوندی بیاوێڵە وەقف ئەکەم لە سەر جەنابی هێژاو بەڕێز برام مەولەوی مەولانا عەبدولرەحیم و پێی ئەبەخشم کە خەرجی ئەوێ بۆقازانجی خۆی وەربگرێت. وە بۆ ئاسودەییم و دەرزوتنەوەو بڵاوکردنەوەی زانست و خوا پەرستی ونزاکردن‌تێ‌بکۆشێ . ئەڵبەتە کەس هەقی دەست تێوەردانی نیە .

## ـ بەڵگەنامەی چوارەم ـ

کارگزاران سرکار عالی مستحضر نبشته ( باشند ).

بشما امر و مقرر میشود همان نهری که بتازگی عالیجناب عزت و سعادت

مآب اخوی مولوی حفرمیکند وازآب سیروان برمیدارد ، از طرف سرکار عالی مرخص‌است . در مالکی خودش میباشد . البته احـدی عـلاقه و رجـوعی بـاو نداشته‌باشد و او رامممانعت نکند. کوتاهی ننمایند ( ودر عهده‌است ) .

۱۲ ص ( أو ) ش ؟

عبدالله

میرمیران

واته :

ئه‌وانه‌ی به‌فه‌رمانی سه‌رکاری هێژا هه‌ڵئه‌سن ، پێتان ڕائه‌گه‌یه‌نم ، فه‌رمانتان پێ ئه‌ده‌م و پێتان ڕائه‌گه‌یه‌نم ئه‌و چۆمه‌ی که به تازه‌یی بـه‌ڕێز و بـه‌خته‌وه‌ر بـرام مه‌وله‌وی هه‌ڵی ئه‌که‌نێ و له ئاوی سیروانه‌وه سه‌رچاوه ئه‌گرێ ، ڕێگه‌ی لێ مه‌گرن و له‌لایه‌ن منه‌وه ئازاده و هی خۆیه‌تی . که‌س بۆی نیه ڕێ گری لێ بکات و ده‌ست له کاری وه‌ردا. که‌م وکوڕی مه‌که‌ن و له‌زامن دایه .

**********

ئه‌م به‌ڵگه نامانه‌گۆشه‌یه‌کی ڕوناکمان له‌ژیانی مه‌وله‌وی ئه‌خه‌نه پێش چاو . جگه له‌وه‌ی که‌سایه‌تی و پله‌وپایه‌ی به‌رزی کۆمه‌ڵایه‌تی ئه‌م شاعیروزانایه دیاری ئه‌که‌ن ، ئه‌وه‌شمان پێ ئه‌ڵێن‌که ده‌سته‌ڵات دارانی ئـه‌وڕۆژگاره مشـوری ژیـانی مه‌وله‌وی‌یان خواردوه.

عه‌بدوڵا ـ میری میران ـ واته عه‌بدوڵا پاشای بابان ، بۆته خه‌م خۆریو هه‌وڵ ئـه‌دات کـه ژیـانێکی ئـاسوده‌و ئـارام بـه‌سه‌ربه‌رێت و تـه‌نانه‌ت خـه‌می ده‌ستوپێوه‌نده‌کانی مه‌وله‌ویشی خواردوه . به پێی ئه‌م‌شیعره‌ش :

وزان سوی وطن هجرت نمودم.. هتد .

که مامۆستا مه‌لا عه‌بدولکه‌ریم له‌لاپـه‌ڕه ( ۷ )ی دیـوانـه‌کـه‌دا هـێناویه‌تی ،

ئەوەدیاری ئەکەن کە پاشاکانی جافیش بە خەمی مەولەوی‌یەوە بوون . وەدیارە بەڵگە نامەی‌تر بەدەستەوە نین ئەگین بەم پێ‌یە دڵنیا ئەبین کە شێخەکانی هەورامان و والیەکانی ئەردەڵانیش بە هەمان شێوە دڵی مەولەوی‌یان ڕاگرتوەو هەوڵی خۆیان داوە بۆ دابین کردنی ژیانی خۆی و کەسەکانی . ئەمەش تەنیا لە بەرخاتری ئەوە بووە کە مەولەوی ئەدیب و زاناو دەمڕاست و خوێن خۆش کەر بووە .

ئەمانە جگە لەوەی کە مەولەوی پەیوەندیی گیانی بە گیانی هەبووە لەگەڵ (شێخەکانی تاڵەبان ، شێخەکانی عەبابەیلێ ، ساداتی سازانو باینچۆ و چۆڕ ولۆن و بەرزنجی وهەروەها لەگەڵ ئەحمەدبەگی کۆماسی و هەندێ کەسایەتی‌تری سەرمایەداری ئەو ڕۆژەدا .

ئەم چینو توێژانە زیاتر نیازیان بەمەولەوی هەبووە ، بۆیە لەوەڵامیدا هەرچی پێویست بووبێ بۆی جێ بە جێ کراوە . ( جاکەسێ ئاوا کەسێ بێ ئەم‌لە کوێ و نان و دۆ خواردن لە کوێ ؟ ) .

## ـ سەرچاوەکانی هونەری شیعری مەولەوی ـ

نەک دیوانی قەسیدە و غەزەلەکانی بە تەنیا ، بەڵکو لە خوێندنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی مەولەویدا بۆمان دەرئەکەوێ کە زۆر هۆشیارانە ڕووی لە ئەدەبیاتی فارسی بووەو ( خەیام ، سەعدی ، حافظ ، مەولانا جلال الدین ، ئەنوەری ، وەحشی بافقی ، صائیب ، کەلیم ، بیدل )ی خوێندۆتەوەو سوودی لێ وەرگرتوون .

بەرهەمی ئەم شاعیرانە دەوڵەمەندترین سەرچاوە بوون کە مەولەوی بەهرەی لێ بردوون ، بەتایبەتی لە پەخشاندا کە لە نامەکانیدا دیارە بەئاسانی سێبەری (سەعدی ) بە سەرەوە ئەبینرێ و لە شیعریش‌دا دنیای ( حافظ )ی تیادیارە .

هەقەواش بووبێ چونکە: ئەودەمەو تا ئەم دواییيانەش (گولستان و بوستان )ی، ( سەعدی ) و ( دیوانی حافظ ) لە دەورەی فەقێیەتیدا خوێنراون، مەولەویش جگەلە خوێندنیان درێژەی بەخوێندنەوەی چەند جارەیان داوە و لەگەڵ هەڵچوونی تەمەنی ئەدەبییدا سوودی لێ وەرگرتوون.

من دڵنیام مەولەوی ئاگای لەشیعر و پەخشانی عەرەبییش هەبووە، بەڵام بە بەرهەمەکانیدا دیارەکە ڕەنگیان لە سەردانەڕشتوەو نەبوونەتە سەرچاوەیەک کە سوودیان لێ وەربگرێ.

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە: ئایا ئەدەبی فارسی تەنیا سەرچاوە بووە کەمەولەوی کەڵکی لێ وەرگرتبێ؟.

لەوەڵامدا ئەبێ بڵێین: نەخێر، کوردیش بەش بە حاڵی خۆی شیعری هەبووەو مەولەویش باش ئاگای لێی بووە. بزانین چۆن و بە چ شێوەیەک.

دیارە مەولەوی ئاگای لە شیعری کرمانجیی ژوورو نەبووە و مەگەر هەر بە ناو ناوی ( عەلی حەریری و مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی ... ) بیستبێ.

هەرچی کرمانجیی نێوەڕاستیشە ئەوە لەگەڵ تەمەنی مەولەویدا زمانی ئەدەبیی بۆ خۆی پێک هێنا. مەولەوی ئاگای لە شیعری ئەم زاراوەیە بووە، بە تایبەتی هاوڕێ وخۆشەویستی ( مەلا عوسمانی فائق ) و ( مەحوی ) بووە و دیارە چەندین دانیشتنی پڕ لە باس و خواسی شیعریان هەبووە. وەدڵنیام هەمان باس و خواسیشی لەگەڵ ( نالی، سالم، کوردی )یشدا هەبووە. چونکە ناکرێ ئەمانە پێکەوە لە شارێکدا ژیابن وهەر چواریشیان شاعیری ناودار بن و ئاگایان لە یەک نەبووبێ، بەڵام شیعری ئەم شاعیرانە لەگەڵ دنیای شیعری مەولەویدا لێکەوە دووربوون، بۆیە ناکرێ کاریان کردبێتە سەری و بە هیچ شێوەیەکیش جێ پەنجەی ئەوان بەشیعرەکانیەوە دیارنیە.

کرمانجیی خوارووش که ( کرماشان ) و ( لورستان ) ئەگریتەوە . تائێستە ئەوەی دیار بێ شاعیری وەهای تیا نیە کە بووبێتە سەرچاوە بۆ مەولەوی ، لەم گۆشەیەی کوردەواریداٰ ( کاکەییەکان ـ ئەهلی حەق ) زۆرترین شاعیریان تیاهەڵکەوتووە، بەڵام ئەمانیش شاعیری هونەرمەندیان تیا دیار نیەو شیعرەکانیان هەمووی بۆ ڕاگەیاندنی دینەکەیان تەرخان کردووەو بە زمانی خەڵکی ڕەشۆکی وتراون .. یانی ئەمیش هیچ .

ئەمێنێتەوە سەر هەندێ شاعیریتری وەکو ( صەیدی یەکەم ، شێخ شەهابی لۆنی ، شێخ شەهابی کاکۆزەکەریایی ، میرزا عەزیزی موجەشی ، یوسف یاسکە ، ئەڵماس خانی کەنوولە ، میرزا شەفیعی کولیایی ، مەولانا دەردین ، ڕەنجووری ، وەلی دێوانەو هەندێکیتر ) ئەم شاعیرانە هەرچەندە زۆربەیان بەرهەمی کەمیان دیارە ، بەڵام بەوکەمەشدا ئەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین کەکەسیان نەیانتوانیوە ببنە قوتابخانەو مەولەوی تێیاندا فێر بێ .

کە واتە لە مێژووی شیعری بەهەورامی وتراودا کە مەولەوی ڕووی لێ بووە، تەنیا دوو شاعیر ئەمێنێتەوە کە جێگای ئەوە بن مەولەوی کەڵکی لێ وەرگرتبن . ئەویش ( بێسارانی ) و ( خانای قوبادی )ن .

هەرچەندە شاعیرێ ترمان هەیە بەناوی ( هادی ژانی ) کە هەردەنگی هەیەو ڕەنگی نیە ، بەڵام بەوەدا کە ( مەلا عەبدوڵای داخی ) لەلاواندنەوەی مەولەویدا ئەڵێ :

جادار ڕەویەی (بێسارانی ) بی
ساحێب تەریکەی ( هادی ژانی ) بی

دیارە شاعیرێکی بەدەسەڵات بووە، بەڵام بەداخەوە کوا ؟[1]

بێسارانی لە خەیاڵ ناسکی و ڕۆمانتیکدا گرەوی بردۆتەوە ،لە دیوانەکەی مەولەویدا ناوی دیارە و بەم زوانەش دیوانەکەی خۆی بەتەواوی چاپ ئەبێت .

مەولەوی گەلێ سوودی لەم سەرچاوەیە وەرگرتوە . هەرچەندە دنیای شیعریان لە یەک شتی سەرەکیدا لەیەکەوە دوورن . ئەویش ئەوەیە کەمەولەوی لە شیعروتن‌دا جەم و جۆرترەو زیاتر بە سەر واژەو تەرکیباتدا زاڵە ، مەبەستم ئەوەیە کە ئەوەی بێسارانی بە غەزەلێک ئەیلێ ، مەولەوی بە بەیتێک ودوان تەواوی ئەکات .

خانای قوبادیش شاعیرێکی دەوڵەمەندە ، جگە لە ( حەوت و بەند ) و (دیوانی قەسیدەو غەزەلەکانی ) ، شاکاری ( خوسرەووشیرین ، شیرین و فەرهاد ، لەیل و مەجنون ، یوسف و زلێخا ، ئەسکەندەر نامە )یشی هەیە ، ئەم‌شاعیرە زۆر بەدەسەڵات و غەڕایە . بەتایبەتی لەشاکارەکانیدا حەشری کردووە ، هەرچەندە شوێن پێی (نیظامی گەنجەوی ) هەڵگرتوەو وەکو ئەمانەتی ئەدەبییش خۆی نەی‌شاردۆتەوە ، بەڵام کارێکی کردووە بۆ کورد کەنمونەی نیە .

ئێستە بزانین چۆن‌بۆتە سەرچاوەیەک کە مەولەوی سوودی لێ وەربگرێ ؟

١ ـ لەدیوانەکەی مەولەویدا هەندێ جێ پەنجەی دیارە .

٢ ـ بە پێویستی ئەزانم گوڵبژێرێ لە ( خوسرەوو شیرین ) ەکەی بکەم‌و هەندێ بەیتی پێش چاو بخەم ،کە دەربکەوێ بەنیازی ئەوەی سەرچاوەیەکن و مەولەوی سوودی لێ وەرگرتوون.

---

١ – بەندە چوارساڵ لەمەوبەر ئەم عەشقە گەیاندمیە گوندی ( ژان ) کە یەکێکە لە گوندەکانی ژاوەڕۆ لە پشتی (بێساران)ەوە. گەلێ سۆراخم‌کرد . بەڵام بەداخەوە بەدەستی خالی و نائومێدی گەڕامەوە .

**جەشنۆی نەسیم خامەی بۆسونبوڵ**
**مەشکاوۆ خونچەی تەعریفش چون گوڵ**

**جە وەنەوشەی وەسف ذاتی ئەوسەروەر**
**مەکەرۆ پڕ عەتر عەرسەی هەفت کیشوەر (ل ۴)**

**واتە :** لە شنەی بای نەسیمی قەڵەمێ کەبۆنی سونبوڵ ئەبەخشێتەوە ، خونچەی باس کردنی وەکو گوڵ ئەپشکوێ . لەوەنەوشەی وەسپی زاتی ئەو سەروەرەدا مەیدانی هەر حەوت کیشوەرەکەی دنیا پڕ لە عەتر ئەکات .

**ناگا جە وەختێ مینای سوبح دەم**
**جەجام خورشید ڕەوشەن بی چون چەم (ل ١٥)**

**واتە:** ناکاو لە کاتێکدا شوشەی کازیوە، لە پیاڵەی خۆردا وەکو چاو ڕووناک بوویەوە.

**خەدەنگش مەویەرد جەکۆی سەنگی خار**
**چون نەسیم جەلوول حەلقەی زولفی یار**

**مەشکاوا شمشێر برندەش حەجەر**
**چون سینەی عاشق نەئەبرۆی دلبەر (ل ٢۴)**

**واتە :** تیرەکەی کێوی بەردی خارای کون ئەکرد ، وەکو چۆن بای نەسیم بە پێچ پێچی زوڵفی یارداتێئەپەڕێ . شمشێری بڕندەی بەردی لەت ئەکرد ، وەک چۆن ئـەبرۆی دلبەر سنگی عاشق ئەبڕێ .

**شۆڵەی ئافتاب وێنەی مەودای تێخ**
**سیلسیلەی گێسوی شەوبری جەبێخ (ل ٦٨)**

**واتە** : پرشنگی خۆر وەکو نوکی تیخ ، زنجیرەی زوڵفی شەوی لە بن‌دا بڕی .

**چون جەشۆڵەی شەمس ئالآی زەرین باڵ**
**نە سەرکۆوان سەنگ درەوشا چون لاڵ (ل ٩٢)**

**واتە** : چونکە بە پرشنگی خۆری بەرزی باڵ زێڕین ، بەردی سەرکێوەکان وەک لەعل درەوشانەوە .

**یاقوتی ڕەنگم جە توغیانی دەرد**
**زەرد بیەن تەمام چون کارەبای زەرد (ل ١٢٨)**

**واتە** : ( یاقوت )ی ڕەنگم لە بەرهەڵچون و زۆربوونی دەردو ئازار وەکو کارەبای زەرد زەرد هەڵگەراوە .

**هیچ نەفسێ جە چەنگ بەڵاش نەرەستەن**
**سەبوی کێ وە سەنگ میحنەت نەشکەستەن ؟**

**کێ بە کەدوی ئەو نۆشا ئاوی سەرد**
**نەوی جە ئیسقا وێنەی کەدو زەرد**

**واتە** : هیچ گیانێ لە چنگی بەڵای ڕزگاری نەبوو ، کووپەی کێ بە بەردی مەینەتی‌ی ئەونەشکا ؟ . کێ لە کوولەکەی ئەوا ئاوی ساردی خواردەوە و لە تینوانا وەکو کوولەکە زەرد هەڵنەگەڕا ؟

( جاران کوولەکەی زەردیان هەڵکۆڵیوەو ئاویان بۆ خواردنەوە تێدا هەڵگرتوە )

شەوێ چون بە دوڕ پیرۆزەی ماوی
مێخ ڕێز کریا چەرخ زوهرەی سەماوی (ل ٣٠٧)

**واتە :** شەوێ وەکو بەخشلی پیرۆزەی ئاوی ڕەنگ ، بزمار ڕێژ کرا چەرخی زوهرەی ئاسمان.

چون عەرووسی ڕۆ جەبەندی شەو ڕەست
ئاینەی ڕەخشان خورشید گێرت بە دەست (ل ٣٤٠)

**واتە :** چونکە بووکی ڕۆژ لە بەندی شەو ڕزگاری بوو ، ئاوێنەی درەوشاوەی خۆری گرت بە دەستەوە.

چون عەروسی ڕۆ بەدەوانی دەو
جە خەیاتخانەی پڕ زوڵماتی شەو

نیم‌تەنەی موشکی مێخەکی‌ی پۆشا
ئافتاب نە مولک مەغریب مەی نۆشا. (ل ٣٧٩)

**واتە :** وەکو بووکی ڕۆژ بە پڕتاو لەخەیاتخانەی تاریکستانی شەو سوخمەی ڕەشی وەکو مێخەکی پۆشی و خۆردتاو لە موڵکی خۆراوادەستی کرد بەمەی خواردنەوە.

سەراوان جە یەخ چون نوقرەی فوتات
مدرەوشا چون دوڕ نە عەرسەی وڵات (ل ٥٦٣)

**واتە :** سەرچاوگەکان کە بووبوونە سەهۆڵ وەکو وردە زیو لە جەرگەی وڵاتا وەکو دوڕ ئەدرەوشانەوە.

بە گۆی غەبغەبش ماچی قەترەی ئاو
موعەللەق مدان نە پای ئافتاو (ل ٥٩١)

**واتە :** گۆشتی ژێر چەناکەی لە دلۆپێ ئاو ئەچێ کەدرابێتە بەر تیشکی خۆر.

ئەمانەو سەدان نمونەی‌تر کە لەبەرهەمەکانی خانادا ئەیبینین ، سەرچاوەیەکی گەورە بوون کە مەولەوی بینی هونەری پێوە ناون و بەئارەزوو تاسەی تینویەتی شکاندووە .

کە واتە شان بە شانی ئەدەبی دەولەمەندی فارسی ، شیعرەکانی ( بێسارانی ) و (خانا)ش دوو قیبلە بوون کەمەولەوی بۆنوێژ کردنی شیعر ڕووی تێ‌کردوون . ئەڵبەتە پێویستە لە دوای ئەمان باسی دوو شاعیری‌تر بکەین ، ئەوانیش (صەیدی دووەم ) و (مەهجوری )ین کەهاو چەرخی مەولەوی بوون ،بەڵام هەندێک بە تەمەن لەم گەورەتر بوون .

ئەم دوو شاعیرە ئەگەرچی قوتابخانە نین ، بەڵام بۆ سود وەرگرتن باشن و مەولەوی بە خوێندنەویان بەهرەی بردووە .

شاعیرەکانی هاوچەرخی خۆیشی کە بە هەورامی شیعریان وتوە وەکو( بولبول ، کۆماسی ،کاک‌ئەحمەدی پریس ، داخی ، مەلا نیظام ، مەحروم ، شێخ عەزیز و شێخ عەبدولڕەحمانی جانەوەرە، شێخ یوسفی نۆسمە ، شێخ عەبدولرەحمانی تاڵەبانی ، میرزا ئەولقادری پاوەیی ، فخرالعلماء ، صەرعی ، مەلا ئەحمەدی نۆتشەیی ، مەلا خەیاڵ ، مەلا چراخ ، فانی ،فەوزی ، عەبدوڵا بەگی شەردف بەیانی ، یوسف بەگی شەرەف‌بەیانی) . بە پێچەوانەوە مەولەوی بۆئەمان بۆتە سەرچاوە و لە قوتابخانەکەیدا فێری هونەر بوون .

کە واتە لەلایەکەوە ئەدەبی فارسی و لەلایەکی‌ترەوە هەندێ لە ئەدەبی کوردی چرایەک بوون لەبەر هەنگاوە شیعریەکانی مەولەویدا وبەرەو لوتکەی خۆی ڕێگای بڕیوە.

## - واژە -

مەولەوی ئەوەندە زاڵ بووە بە سەر واژەدا ، هەرگیز لە هیچ بەیتێکیدا هەست بە نامۆبوونی واژەیەک ناکەیت ، هەر ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی کە شیعرەکانی خێرا ئەچەسپێن بەدڵەوە ، دیارە شاعیر تا واژە لە دەستیدا وەکو مۆم وابێ باشتر ئەتوانێ شیعری سەرکەوتو بدات بە دەست خوێنەرانیەوە .

ئەم دیاردەیە لای ( نالی ) پێچەوانەیە . زۆر جار واژە لە لای ئەم نامۆن و بە زەحمەتێکی زۆر و خۆماندوو کردنی نالی توانیویانە ببنە بەردی بناغەو دیواری بەیتێک ، بۆیە لە فۆرمی واژەکاندا هەست بە نامۆیی ئەکرێت و بە زەحمەت لە پەردەی گوێوە ڕەوانەی مێشک ئەبن . لە مێشکیشدا ئەبێ بە شێوەی تەکنیکی نالی چەند جار بیخوێنیتەوە ئینجا بۆت دەرئەکەوێ کە واژەیەکی نامۆنیەو لە شوێنی خۆیدا ڕست کراوە . ئەلبەتە ئەمەش هونەرێکی بەرزە ، بە مەرجێ شاعیرە کە دەستەڵاتدار بێ و بتوانێ هونەرمەندانە جێگای بکاتەوە ، ئەمە لە ڕەوشتەکانی شیعری قووڵ و پڕ پێچ و پەنایەو بەمەش لە جۆرەکەی تری شیعر واتە ( سهل ممتنع ) جیا ئەبێتەوە .

بە دوای نالیدا ئەم شێوازە لە مەحوی و هەندێ لە حەریق و لە شیعری (خەوە بەردینە)ی سوارەی ئیلخانیزادەدا ئەبینین .

بەڵام گەورەیی مەولەوی لەوەدایە کە بە فۆرمی شیعرەکان واهەست ئەکەیت لە خانەی (سهل ممتنع )دا گیرساونەتەوە ، کە چی زۆر جار واژەکان چەند سادەن ، بەڵام لەگەڵ سادەییەکەی خۆیاندا لە ژێر پەردەیەکی تردا واتایەکی تریان بە خۆوە گرتوە . یانی گەلێ لە بەیتەکانی مەولەوی هەم ( سهل ممتنع )ن و هەم قووڵو پڕ پێچ . چونکە واژەکان چەندێ بە شێوە سادەن ، ئەوەندەش لە ناوەڕۆکدا قووڵن . بۆ نمونە با ئەم بەیتانە بخوێنینەوە

ساقی ، پام بەستەی زنجیری پیرین
دەسم دامانت وادەی دەس گیرین

چابوک بەو ڕەفتار بێ درەنگەوە
خەرامان بەو ناز باڵای شەنگەوە

جامت جەم ئاسا لەب ڕێز کەر جەمەی
پێم نۆش کەر وەیاد بەزم ئارای کەی

مەستی وەپیران جەوانی مدۆ
هێزی دووبارەی زرانی مدۆ

پێم دەر تاپەی پەی پێوە هەی کەروون
ڕای سەختی سارای مەحشەر تەی کەروون  ل ٤٥٩ ـ ٤٦٠

لەم چەند بەیتەدا ( ساقی ) لە باتی ( خوا ) دانراوەو ( مەی ) باوەڕو ئیمانە. واتە لە ناوەڕۆکدا مەولەوی داوا لە خوا ئەکات کە ئیمانی زیاتری پێ ببەخشێ بۆ ئەوەی ڕێگای چوونە مەیدانی مەحشەر بە سەر بەرزی ببڕێ.

واژەی ( کەی ) یش کە مەولەوی بە جێگەی ( گەورە ) هێناویەتی ، مەبەستی گەورە پیاوانی خوایە وەکو ئەولیاو ساڵحەکان .

مەولەوی نمونەی تری لەم بابەتەی هەیە ، بەڵام بە گشتی ناتوانین بڵێین شیعرەکانی وەهان، گرنگ ئەوەیە توانیویەتی لەم باخچەیەشدا نەمامی خۆی بڕوێنێ و واژە بدات بە دەست خوێنەرەوە کە واتا قاموسیەکەیان نەبەخشن .

زۆر زۆر جاری تر شاعیر واژە بە تەنیا دانانێ ، بەڵکو واژەیەکی تری بۆ ئەخوازێ و ئەیکاتە تەرکیبێکی هونەرمەندانە ، ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتەکانی و توانیویەتی زۆر کارامانە لەم دەریایەدا مەلە بکات و پشوی سوار نەبێت .

هەندێ جار ئەم تەرکیباتانە بە دوای یەکدا دێنێ ، بە شێوەیەک نەک زیان لە

شیعرەکە نادەن ، بەڵکو ئەوەندەی تر ئەیانڕازێنێتەوە . وەکو :

قەڵای ویرم سەیل هووناو بەردەبی
بورجی ئاگاییم وێران کەردەبی

کێشکچی خەیاڵ خەم فام سەندەبی
دووکانچەی بەدەن بێ کەس مەندەبی

تەرکیباتەکان ئەگەرچی هەندێکیان لە لایەن شاعیرانی پێش خۆیەوە بە تایبەتی شاعیرانی کلاسیکی فارس وتراون ووتراونەتەوە ، وەکو :

( دانەی مەرجانیی هەرس ، خاروخاشاکی موژە ، میراوی سەرجۆی بادە ، پەردەی دڵ ، پای شادیم ، ژاری ماری دەرد ، نەسیمی وەسڵ ، ڕیشەی ویر ، ڕوخساری زەوق ، دەرگای عەدەم ، شەرارەی ئائیرەی فیراق ، حەسرەتی دەردی جیاییت .. هتد )

بەڵام زۆریان دەست چنی خۆینی وەکو :

( قەڵماسکی تنیای سەردیی مەیل ، باڵی بەیداخی تاقەت ، دەوڵەتکەی وەسڵ ، دووربینەکەی چەم ، پۆسی کووسی گۆش ، ڕاداری سوڵتانەکەی خەم ، هەنارەکەی دڵ ، دێوەلولی ئاخ ، قرچەو چۆقەی جەرگ ، هەڵوای موحیبەت ، ئاهوی توونی دڵ ، شنۆی شەوبەرات ، لوولەی پێشەی ڕێش ، شەتاوگەی شادی ، شنۆی پارێزی خەیاڵ ، دووهاچەی چەتاڵ ، ئەڵماسی دووریی ، بنەکداری خەم ، گێجی زرێواری هەرس ، زایەڵەی سەمتوری کەللە ، هتد ) .

مەولەوی بێ ئەوەی خۆی بەستبێت بەوەوەکە بە هەورامی شیعر ئەڵێت و ئیتر نابێ لێی دەربچێ ، گەلێ جار واژەی زاراوەکەی خۆی بەکار دێنێ و ئەوەندەش جوان جێگەی کردۆتەوە کە هەست بە نامۆ بوونی ناکرێ و بە شێوەیەک لەگەڵ واژەکانی تردا بۆتە دەستەخوشک کە هەورامییەکی جافی نەزان بە ئاسانی وەری

ئەگرێت.وەکو:

وەخیلافەوەن یارانی سەرمەس

تەقازای زاتی تەبعم هەرچی هەس    ل ٤٥٢ دیوان

لێرەدا واژەی (هەس)واژەیەکی جافی‌یەو لە جێگای (هەن)دارێژاوە.

ڕیشێ چەنی من نەیۆ وەحزوور

مبۆ بتاشووش تا وەنەفخ سوور ل ٢٩٢ دیوان

واژەی (ڕیشێ)جافیانەیە یا سۆرانی ،لە هەورامیدائەوترێ (ڕیشیۆ).
یاواژەی (جارێ)لەگەڵێ بەیتداوەکو:

تکەش عاجز کەرد خەیاڵت تێشدا

ئازیز بۆ جارێ پابنیە پێشدا    ل ٥٣٩ دیوان

کە بە هەورامی (جاریۆ)ئەگوترێ ،هەروەکو خۆیشی لەم بەیتەدا واهێناویەتی :

دەوڵەتکەی وەسڵ پانەزەواڵەن

جاریۆ تەر دیدەن باڵات مەحاڵەن    ل ٥ دیوان

ئەمانەو هەندێ نمونەی ترکە لە خوێندنەوەی دیوانەکەیدابەر چاو ئەکەون. هەموویان ئەوەمان پێ ئەڵێن کە مەولەوی ئەگەر چی هەورامیشی چاک زانیوە،بەڵام هەندێ جار بە ئەنقەست یالە بەر زەرورەتی شیعر واژەی ناوچەکەی خۆی بە کار هێناوە.بێ ئەوەی گرفتێکی بۆزاراوەی هەورامی وشیعرەکانی خۆی دروست کردبێت . هەندێ جاری تر پەنای بردۆتە بەر واژەی تازە، واژەگەلێ کە ڕەنگە

هەرلەو دەورانی ژیانی مەولەویەدا کورد پێ‌یان ئاشنا بووبێ . ئەم خێرا وەری گرتوون ولە شیعردا بە شێوەیەکی جوان جێگای کردوونەتەوە،وەکو (میقناتیز) کە لەم بەیتەدا ئەیبینین:

جەزبەی ئاهینم دەماخ دان پەرداخ

میقناتیز تۆی جام کەردەن وەیاتاخ (ل ٤٥٢ دیوان)

یا(دووربین):

پۆس کووس گۆش نەم کێشان کەم کەم

ئەم سەرەو سەرەن دووربینەکەی چەم (ل ٤٧٧ دیوان)

ئەم کارە دەستی هونەرمەندیکی بەتوانا ئەتوانێ بیکات و وەهاجێگایان بکاتەوەکەهەر وەکوماڵی کوردبن وەهان.دیارە ئەگەر ئەم دەورانەشی بدیایە زۆر بە ئاسانی واژەی (فریزەر،تەلەفیزیون، ڕادیۆ، ئۆتۆمۆبیل ...هتد)جێگائەکردەوەو زۆرباش‌ئەیکورداندن.هەندێ جاری تر شاعیر یاری بەواژە ئەکات ،وای لێ ئەکات کە مانایەکی تر بەخۆوە بگرن و هەم ئاماژەش بن بۆئەوشتەی کەقسەی لە سەر ئەکات .وەکو:

لوقمەکەی ماساوقووڵی دەریای مەیل

لوخت سای کۆڵەی سارای دەردی لەیل (ل ٢٧٦ دیوان)

لێرەدا(لوقمەکەی ماساو) و(کوڵەی سارای)جگەلەوەی مانای تریان وەرگرتوە ئاماژەشن بۆ هەردووگوندی (لوقمەماسی)و(کوڵەسارە)کەیەکەمیان‌زیدی ئەومەلا یونسەیە کە شیعرەکەی بۆ نوسراوەو دووەمیان ئەو دێیەیە کەبە مەلایەتی تێیدا گیرساوەتەوە.

یا :

**های وەفەرق دین زامداران تاج دای**
**شەریعەتی مەیل لەیلێ ڕەواج دای (ل ۴۶۲ دیوان).**

لێرەدا هەردوو واژەی ( دین ) و ( تاج ) بە واتا جێگای خۆیان گرتووە ، لە هەمان کاتیشدا (تاج‌الدین ) دێننە یاد کە ئەو کەسەن شیعرەکەی بۆ نوسراوە .

مەولەوی لە چەند شوێنی‌تردا ئەم نەزاکەتەی بەکار هێناوە و هونەرمەندانە شیعرەکەی ڕازاندۆتەوە ، ئەمەش نیشانەی زاڵ بوونی شاعیرە بە سەر واژەدا .

**«کارتێکردنی مەولەوی لە سەر شاعیرانی هاوچەرخی ودوای خۆی»**

ئەوەندەی تا ئێستە دیار بێ لە ڕابوردوی ئەدەبی کوردیدا ، هیچ شاعیرێکی‌ترمان نیەکە بەئەندازەی مەولەوی پەیوەندی بە شەپۆلی شیعری سەردەمەکەیەوە هەبووبێ و توانیبێتی ئاگای لە هەناسە شیعریەکانی سەردەمەکەی بووبێ .

بەو دەستەڵاتە بێ سنوورەی کە لە قەڵەمڕەوی شیعردا هەیبووە ، لە جوگرافیایەکی دیاریکراوی ئەو دەورانەدا بۆتە سەرباشقەیەک کە زۆر جار شاعیرانی هەورامی گۆ لە خزمەتی ئەودا نرخی شیعری خۆیان زانیوەو دەرسیان لە بەهرەوهونەرو سەلیقەی وەرگرتوە .

مەولەوی سیامەندێکی ڕاستەقینەی سەوداسەری خەجی شیعری کوردی بووە ، هەر لە سەرەتای فەقێیەتیەوە کە لە پاوەو جوانڕۆ خوێندویە زمانی شیعریی پژاوە ، تا ئەوینی زانست دەرگای یەکێک لە حوجرەکانی مزگەوتی جامیعەی سنەی بۆ ئەخاتە سەرپشت و ئیتر لەم شارە سیخناخ لە ئەدەب و زانستەدا ڕۆژ بەڕۆژ پلەی خوێندەواری و هونەریی ئەچێتە سەرەوە تا هەردووکیان بە لوتکەیەکی پڕ لە شانازی ئەگەیەنێ .

لە خوێندندا ئەبێتە مەلای مەلایان و لەشیعریشدا ئەبێتە قوتابخانەیەک کە

شاعیران تێیدا بخوێنن و فێری ئەو هونەرە ببن .

لێرەدا نامەوێ وناتوانم باسی هەموو قوتابیەکانی بکەم ، بەس چەند نموونەیەک ئەهێنمەوە کە هیوادارم ڕۆشن کەرەوەی مەبەستەکە بن .

١ ـ حاجی مامۆسا : مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا عەبدولڕەحمان کوڕی مەلا ئەحمەدی موفتی سلێمانی ١٢٨٠ لە نۆدشەی هەورامان لە دایک بووە . ١٣٠٢ لە شاری سنە کۆچی دوایی کردووە . لە زانستدا بە پلەی بەرزی ( مفتی ) گەشتوەو لە شیعریشدا ئەوەی کەدیار بێ شاعیرێکی باشە ، هەرچەندە بە داخەوە لە شێوەی دیواندا شیعرەکانی کۆنەکراوەتەوە . بە کوردی و فارسی شیعری هەیەو لە شیعرە فارسیەکانیدا نازناوی ( فانی ) بۆ خۆی هەڵبژاردوە .

زۆرتر لە شیعرە کوردیەکانیدا شوێن پێی مەولەوی هەڵگرتوە ، هەرچەندە بە مەولەوی نەگەیاندووە ، بەڵام باش بۆی چوە . ئەمە نمونەی شیعرێکیتی :

چەندە پێم واتی : هایدڵەی غافڵ
حەق حەقیقی ، ئیزافەی باتڵ

پەردەی ئەوجەماڵ موتڵەق جە ئیتڵاق
ئاوێنەی مەعکووس میرئاتی ئافاق

بۆ بەبای موراد نەشئەی سافی مەی
بە یاری مەللاح سۆزی ناڵەی نەی

کەشتی غەرق کەوتەن نەگێجاوی وەی
یاونە وەساحیل ئی بەحر بێ پەی

باکەرۆش کۆتا گڵپەی کوورەی دڵ
شەرارەی سەبوون چۆڵەکەی مەنزڵ

تۆ بەتەردامان عیسیانت تەڕ بی
وێنەی بەدبەختان ئاخرت شەڕبی

هیچ نەبیت وەتەنگ دما ڕۆی فەردا
دەی تا مەتاوی بدە وە سەردا

ئەم شیعرە لە دنیای ئەو شیعرانەی مەولەوی دان کە بۆ دەردە دڵی خۆی وتونی .

با لە هەندێ شیعری تریداچەند بەیتێ هەڵبژێرین کەدنیای مەولەوی یان تێدا دیارە.

هەر لاسەیلی هوون نە سەرچەمەی چەم
کلپەی ناری دڵ ، ناڵەی کوورەی دەم

پرکەردەن شەتاو ناوانی گەردوون
سۆچنای شەخەڵ ژیای دنیای دوون

تەمی غەم نەسەر سەرکڵاوەی دڵ
چەترەن چون گێسوی جەمین پەڕەی گوڵ

...

سەردیی هەناسەی ئێلاخەکەی دڵ
وستەن سیاکار بەختم جەسەرچڵ

...

زاهیر هەم فەڵەک کەڵەک بەستەبۆ
دیسان دڵ وەتیر دووریی خەستەبۆ

ئەسرین هەم تاف وست وەڕووی ڕوومەدا
تفڵ ئاسامەدۆ وێش وەبوومەدا

لازم کەردەن لێم فەسڵەکەی پایز
دوور وستەن وەهار وەسڵەکەی ئازیز

٢ ـ حەیران ( ١٢٥٠ ـ ١٣٠٥ ) شێخ محەممەد ساڵح کوڕی شێخ ئیمام الدین ناسراو بە ( فخرالعلما ). زاناو هاوچەرخی مەولەوی بووە ، لە شیعردا خۆیمان بە ( حەیران ) پێ ئەناسێنێ ، بەکوردی و فارسی و عەرەبیشیعرو پەخشانی هەیە . بەداخەوە تا ئێستە بەرهەمەکانی کۆ نەکراونەتەوە ، بەڵام لەم لاولا هەندێکی دەرکەوتوون و نیشانەی شاعیرێکی باشیان پێوەیە . زۆر هەولیشی داوە کە سوود لە بەهرەو توانای مەولەوی وەربگرێت . شایانی باسە هاوڕێی خۆشەویستی یەک بوون ، هەرچەند مەولەوی ( ٢٩ ) ساڵ بەتەمەن لەم گەورەترە ، بەڵام چونکە پلەی زانایی و شاعیرێتی بەرزبووە ، ئەم دوو شتە چاوی لە تەمەنپۆشیوە و لێکی نزیک کردوونەتەوە . لەگەڵی لە بەیتەکانیدا تام وبۆی مەولەوی ئەبینین . بۆنموونە با سەیرێکی ئەم چەند بەیتەی بکەین لە شیعری ( دیاردان وەهار )دا .

مەی پەنهان نەجام سافی گوڵاندا
تلوعی نەشئەش نەتۆی دڵاندا

شەونم سوب نەڕووی سەوزە دیاران
چون قەترەی عەرەق زوڵفی نازاران

شێنی شەتاوان ، شنۆی سەرکاوان
چون خاڵ خاڵی بەور ڕیشەی دڵ کاوان

شنۆی سەرکاوان کەی سەفا مەدۆ ؟
چون نێشی نەشتەر پێم جەفا مەدۆ

سەوزە چەمەنان کەی دەوا مەدۆ ؟
هاژەی وەفراوان کەی دەوا مەدۆ ؟
یا :
وادەی سەفاو سەیر سەردیارانەن
وەختی نۆشانۆش بادە خوارانەن

من پەی تۆ بەزمم گەرمەی زاری یەن
ناڵەی نەی کزەی زامی کاری یەن

ئارۆ من دەردم سەرمەشقی قەیسەن
نەجدم سارای ساف پای ( قوللەی وەیس )ەن

با لە شیعری ( نازک ساراو دەشت ) یش دا ئەم بەیتانە بخوێنینەوە کە بەشێوەی ئەردەڵانی وتویە :

سانەیچی دەی نەی ، سا دەروێش دەفێ
قەزای پەنجەتان لە گیانم کەفێ

تۆ وەسەدای دەف ، ئەو وەناڵەی نەی
جەرگم لەت لەت کەن ،ڕیشەی دڵ کەن پەی

بەڵ وەها کەمێ زامم ساکن بێ
ساتێکیچ دنیا وەکام من بێ

لە شیعرە بەناوبانگەکەیدا ( ئازیزم بەستەن ) ئەم بەیتەی مەولەوی تێهەڵکێش کردووە .

واتای ( پیر ) وقافیەی بەیتەکەیشی پێ دروست کردووە .

٤ـ بەیتی نۆهەم :

پەی تەشویش ناگا قاسید جەلاوە
چون پەیک نەسیم مدرا وەپاوە

لەم بەیتەش‌دا کاک خالید دیسان واژەی پاوەی خستۆتە ناو دووکەوانەوە ، وەک ئەوەی ناو هێنانی شاری پاوە بێت . بەڵام نا ، ( مدراوەپاوە ) یانی ( وەستا بە پێوە ) .

٥ ـ ئەو بەیتانەی کە کاک خالیدیش ئاماژەی پێکردوون و هـی مـەولەوین ، لە نوسخەی لای (وارستگان)یش‌دا هەروان ، بەڵام لە دوو نوسخەی لای ئێمە دانین و ئەم دوو نوسخە جێگای باوەڕن ، چونکە بە عـالەمی ئـاشکرا ئـەو بـەیتانە مـولکی مەولەوین .

٦ ـ ئەو شیعرە بەو شێوەی کە کاک خالید بڵاوی کردۆتەوە گرفتی قافیەی تیایە ، بڕوانە ئەم بەیتە :

زانام گرد داغدار ، داغ دووری تۆن
گرد بەرگ سیای ، ئاهە سەرد تۆن

هەردوو ( تۆن ) ڕەدیفن و ( دووری ) و ( سەرد )یش نابنە قافیە ، لای ئێمە بەم شێوەیە :

زانام گرد داغدار داغی دەردی تۆن
گرد بەرگ سیای ئاهی سەردی تۆن

یا ئەم بەیتە :

دەوات چون دەروون نە تەلاتومدا
لیقەوێش کێشان وەلیتەی خەمدا

( تەلاتوم ) و ( خەم ) قافیەیەکی ناڕەسان . لە باتی ( خەم ) ، ( خوم ) دروستە ، کە

ڕەنگێکی شینی تێرەو شاعیر لەوێدا مەبەستی مرەکەبە ـ جەوهەر .

ئەم شاعیرە ئەوەی باشە لە زۆر لە شیعرەکانیدا بە نـازناوی ( سـەرعی ) مـۆری خۆییان لێ ئەدات ، ئەمەش بۆ گرێ کردونەوەی ئەو تێکەڵ و پێکەڵیەی لە شیعری بە هەورامی وتراودا هەیە شتێکی باشە .

ئێستە بێینە سەر ئەم و مەولەوی و کارتێکردن .

سـەرعی بە پێی ئەو هەندە شیعرەی کە لە بەر دەستدایە ، نیشانەی ئەوەی پـێوە دیارە کە لە ژێر سێبەری کارتێکردنی مەولەویدا ئارامی گرتوە . بۆ نمونە :

١ ـ مەولەوی لە شیعری ( بـەرزان هـیلال تـار )دا ل ٦٨ - ٧٠ بـە شـێوەیەکـی هونەرمەندانەو وەک داهێنانێ قافیەی لەدوابەیتەکانی شیعرەکەیدا شێواندوە ، ئەمیش لە شیعری ( تو خواگیانی وێت )دا پەیڕەوی ئەو خەتەی مەولەوی کردوە . ئەگەرچی ئەو شیعرە کاک خالیدی مەنسوری لە سروەی ناوبراودا بڵاوی کردۆتەوە ، بەڵام چونکە لەگەڵ نوسخەکانی لای مندا جیاوازییان هەیە بە پێویستی ئەزانم منیش لێرەدا بڵاوی بکەمەوە .

تو خوا گیانی وێت ئەرنەواچی پێش

ئی زاری و شینە بە ئەو یانی چێش ؟

با مندوو دیدەم هووناو پاڵا بۆ

ئەو بەو دیدەی مەست گرینش پەی چێش ؟

با من ڕوخسارم تەڵا جەڵا بۆ

ئەو زەردیی ڕوخسار نەسرینش پەی چێش ؟

با من فەریادم فەرهاد ئاسا بۆ

ئەو خەمیی قامەت شیرینش پەی چێش ؟

با من ئاشوفتەو شێت و شەیدا بۆ
ئەو پەشێویای زوڵف چین چینش پەی چێش ؟

با من قامەتم هیلال نمابۆ
ئەو سەروی قامەت خەمینش پەی چێش ؟

با من شیوەنم هەزار ئاوا بۆ
ئەو بەو دیدەی مەست گرینش پەی چێش ؟ [1]

با من هەر ناڵەم ناڵەم [2] باڵا بۆ
ئەو ناڵەی دڵەی حەزینش پەی چێش ؟

با من دەروونم مەینەت ئەفزا بۆ
ئەو دڵەی چون سەنگ نگینش پەی چێش ؟

با من دەس زانوی شام و سەبا بۆ
ئەو دەس وەزانوی سیمینش پەی چێش ؟

با من چون ( سەرعی ) شێت و شەیدا بۆ
ئەو پەشێویی خاڵ جەمینش پەی چێش ؟

با ئەو کەس ناڵۆ کام نەیاوا بۆ
ئەو وەکام یاوان ناڵینش پەی چێش ؟

---

١ - ئەم میصرەعە دووبارە کراوەیە .

٢ - ناڵەمی دووەم کورت کراوەی ( نەئاڵەم )ە = نە عالەم

٢ ـ شیعری (٨)ی پیتی (هـ) شیعری ئەم شاعیرەیەو بە هەڵەپەڕیوەتە ناو دیوانی مەولەویەوە . لە نوسخەی ( شەهاب )دا لە سەری نوسراوە ( صرعی در ردیف ) لە نوسخەی ( باینچو )ش دا لە سەری نوسراوە ( لاادری ) واتە : نازانم . یانی ئەمیش هەر بە شیعری مەولەوی نەزانیوەو نەیشی زانیوە کە خاوەنەکەی کێیە .

شیعرەکە چونکە لەگەڵ چاپکراوەکەدا جیاوازیان هەیە ، وای بە چاک ئەزانم لێرەدا بڵاوی بکەمەوە .

وەهارەن ، سەوزەن ، ئاوەن ، سەرکاوەن
هاژەی وەفراوەن ، شاخەی شەتاوەن

تەمەن ، دوکەڵەن ، گەردەن ، غوبارەن
فرمێسکەن ، چەمەن . سەیلەن ، فووارەن

ساقی یەن ، بادەن ، نەسیمەن ، بادەن
بولبول جە دەوری گوڵان ئازادەن

بەزمەن ، شادی یەن ، عەیشەن ، نیشاتەن
کەیفەن ، شۆخی یەن ، شەوقەن ، حەیاتەن

سەنگەن ، کۆسارەن ، سەرکۆوەن ، هەردەن
خەمەن ، مەینەتەن ، زوخاوەن ، دەردەن

دڵەن ، هووناوەن ، دیدەن ، سەیلاوەن
کەمەرەن ، هەردەن ، ملەن ، کڵاوەن

هیجرەن ، دووری یەن ، عیجزەن ، فیراقەن
واوەیلان ، شینەن ،ناڵەی عوشاقەن

سەبزەن ، سۆسەنەن ، نەورۆز گوڵانەن
وەنەوشەن ، یاسەن ، گوڵەن ، هەڵاڵەن

( سەرعی )یەن ، شەیدان [1] نەجدەن ، مەجنونەن
مەزاقەن ، جامەن ، پیالەی هوونەن

٣ـ لە شیعری ( شەماڵ بێزارەن )دا دووجار ناوی مەولەوی ئەبات و دوو میسرەع لە شیعرەکانی دێنێ و تێهەڵکێشی ئەکات . ئەڵێ :

چونکە فەرموودەی ( مەعدومی ) راسەن
هامسایەی یانەی دەوڵەمەن خاسەن

( ئەم میسرەعە لە دیوانە چاپەکەدا نیە ، لە شیعرێکی بڵاو نەکراوەیدایە کە پاشان ئەیبینن ) .

چوار بەیت دوای ئەوە ئەڵێ :

فەرمودەی ( مەعدوم ) ئید وانە وەجۆش
(من دیم تۆ حاڵش نەژنەوی وەگۆش)

( بۆ ئەم میسرەعە بڕوانە مەولەوی ل ١٦٤ ) .

ئەمەش نمونەی چەند بەیتێکی تری کە لە شیعرەکان هەڵم بژاردون بە مەبەستی ئەوەی کە قوتابی بوونی لە قوتابخانەکەی مەولەویدا باشتر بزانرێ .

تورەی توغرای زوڵف میشک بۆ عەنبەر
چون هەوری سیا گێرتەن دەوری خوەر

---

١ - شەیدا = ئامازەیە بۆ کێوی ( شەیا )ی بان لەیلاخ ـ ڕۆژهەڵاتی سنە ، بەشی دێگولان .لە بەرامبەر ( نەجد )دا هێناویەتی ، ئەو کێوەی کە مەجنون تەمەنێکی عاشقانەی تیا بە سەر برد .

پاژنەو پەنجەی پاش پای حوور شکەستەن
دوو دەستی گەردوون چون ( سەرعی ) بەستەن

...

رۆحشان مۆلەقەن هاوە هەواوە
وەڵگی جەستەشان هاوەدەم باوە ...

نەرگس چەم جە گەرد دەردان نەسرەفتەن
سۆسەن زوانش وەلای دەم کەفتەن

...

شەقایق وەرەق بەی تەور شەق وەردەن
وەڵگی زیندەگیش بای فەنا بەردەن

...

ساقی وەمەرگت گوڵان یەند زەردەن
گردین جە زەردیی ڕووی ( سەرعی ) بەردەن

...

نەک چون من دەروون وەخەم پەروەردە
باری خەم قامەت وەکەوان کەردە

...

مەزەی تاڵی تام دووریی وەسڵی گوڵ
ئاوم لێ کەردەن وەژاری قاتڵ

سەرزەمین کاڵای ڕەنگاڕەنگ پۆشان
سەراوانْ چون ئاو دیدەی من جۆشان[1]

۴ ـ میرزاعەبدولقادری پاوەیی ( ۱۲۶۶ ـ ۱۳۲۸ ).

ئەم شاعیرە کە دیوانەکەی چەند ساڵێ لەمەوبەر بە چاپ گەشت لە لایەن کاک هادی سپنجی یەوە ، لە خوێندنەوەیدا هەست بەوە ئەکەین کە ئەم شاعیرە لە نەزمەوە نزیکە تا شیعر ، واتە ئاسۆی هونەری زۆر فراوان نیە ، وەکو لە شیعری ( وادە خەلافی ، لێفە شڕ ، ئاسمان و زەمین ، کولەو ئاینەمەل ، کوتەک لە بەهەشتەوە هاتووە .. هتد ) ئەیبینین کە حیکایەت و ڕووداوی نەزم کراون و هونەری بەلاغەیان تیا نیەو وشک و برینگن .

بەڵام کاتێ کە هاتۆتەوە سەرخۆی و ئاگاداری ئەوە بووە کەمەولەوی چۆن چۆنی شیعر ئەڵێ.دەستی گۆڕیوەو هەوڵی داوە لەدەلاقەی هونەرەوە بڕوانێتە ڕووداوەکان و بە سەر پەنجەی هونەر کاڵا بە باڵای شیعرەکان ببڕێ .

لەم ڕووەوە نمونەی شیعری ( تەپە دوی دوکەڵ ، مەوجی خەیاڵان ، جەفا .. هتد ) شیعری زۆر سەرکەوتوون ، ئەتوانرێ بکرێن بە ناسنامەی شاعیریتی میرزا عەبدولقادر

شاعیر کە دەنگی هونەری دەست پێکردووە ئیتر خۆی سپرانۆتە حوجرە شیعریەکەی مەولەوی یەوەو بەو پەڕی شانازییەوە هەوڵی داوە شوێن پێ ی ئەو هەڵبگرێ .

لە سێ شوێنی دیوانەکەیدا بەڕێزەوە ناوی مەولەوی دێنێ و لەگەڵ ناوبردنیدا بەیتیشی لێ وەرئەگرێ و تێهەڵکێشی ئەکات . وەکو ئەڵێ :

---

۱ - مەولەوی ئەلێ : بەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان

شەوان تاوەڕۆ یادم جەلاتەن
دەک بە ڕەحمەت بۆ ( مەعدومی ) واتەن

( چ حاجەتەن دەس پەی قەڵەم بەروون
یادم نمەشی چەنیت یاد کەروون ) (ل ٣٨ دیوانی میرزا )

یا :

فەرمودەی ( مەعدوم )سەرای خاک ماوان
دەک وەڕەحمەت بۆ چ خاس[1] فەرماوان

( دەروون وەمەودای دووریت بیەن ڕێش
هەی خاکم وەسەر سەوقاتم پەی چێش (ل ٨٨ دیوانی میرزا )

یا :

راسەن نەجای دەنگ نە پای ئامۆشۆن
فەرموودەی ( مەعدوم ) شامڵ هەر وەتۆن

( مەرگ بێ وادەت عەجەب ڕەنگێ ڕەشت
شین وست وەدنیاشادی وەبەهەشت ) ل ١٢٢ دیوانی میرزا

---

١ - بە داخەوە لە دیوانەکەدا نوسراوە ( خاص ) کەئەمە واژەیەکی عەرەبیە بە واتای ( تایبەتی )
ئەبێ لە ( خاس )ی کوردی جیای بکەینەوە بە واتای ( باش ، چاک ) .

لەم سێ شوێنەدا وەکو دیمان میرزا ناوی مەولەوی ئەبات ، بەڵام شوێنی تری هەیە کە بەیتی لەو خواستوەو کە چی ناویشی لێ نەبردووە.وەکو لە شیعری(موناجات ـ۱)دا ل ٦٧ ئەبینین ، کە ئەم بەیتانە هی مەولەوین و تێهەڵکێش کراون .

بەیتی : یا جەگونای من کەرەم ئاوان تەر
رەحمت جە تاوان من فراوانتەر (ل ٧٣ میرزا )
بڕوانە مەولەوی ل ٥٣٦

بەیتی :
هەرتۆنی وەتاق دانای تەوانا
تۆم هەنی ، هەنی کێم بۆ وەهانا (ل ٧٣ میرزا )
بڕوانە مەولەوی ل ٥٣٦

بەیتی :
من وێم مەزانوو کام تۆمم کاڵان
یاران پەی هیمەت وەنەم مەلاڵان ( ل ٧٣ میرزا )
بڕوانە مەولەوی ل ٢٥

بەیتی :
یارەبی نەی شەو تاریکە فانی
هەروێت وەکەردەی بەدیم مەزانی (ل ٧٤ میرزا )
بڕوانە مەولەوی (ل ١٢٩ )

بەیتی
وەرنە جە مەحشەر ، سەرئەفکەندەوێم
شەرمەندەی حزور خودا وبەندە وێم (ل ٧٤میرزا)
بڕوانە مەولەوی (ل ١٢٩ )

بەیتی :

بالەخانەی چەم چەمەراکەی وێت
کوڵ بانی وەخاک تۆز پاکەی وێت (ل ١٤٠ میرزا)

بڕوانە مەولەوی (ل ٥٣٩) کە وای فەرمووە :

باڵاخانەی چەم دێوانەکەی تۆ
بانەناو وەگڵ ئاسانەکەی تۆ

هەندێ جاریش دەقاودەق تەرکیباتی لە مەولەوی هێناوە ، وەکو :

کزەی چزەی زام (ل ٥٢ میرزا)

بڕوانە مەولەوی (ل ٣٥٩) یەکەم بەیت

یا : بوولەکەی جەستەم (ل ٥٥ میرزا).

کەلە (بوولەکەی سفتەم)ی مەولەوی وەرگیراوە (ل ٨٧) . کە لە ڕاستیدا ئەمیش (جەستەم)ە .

یا : کزەی ڕەشەبای هەناسەی سەردم (ل ٣٧ میرزا)

مەولەوی فەرموویە : کزەی ڕەشەبای هەناسانی سەرد (ل ٤٢٠)

یا : یانەی دڵ (ل ٣٧ میرزا)

بڕوانە مەولەوی (ل ٧٤)

لە هەندێ شوێنیتردا بێ ئەوەی شتی لە مەولەوی هێنابێ ، خوێنەر هەست بە دنیای مەولەوی ئەکات . بڕوانە ئەم بەیتانە چەند مەولەویانەن :

هەرگیز نەدام ڕای نەسیم سەحەر
جەو یەخەی کەتانبکەرۆ گوزەر (ل ٤٢)

یا :

سەڵتەی سیای خەم تاکەی نەدۆش کەم ؟

حەلقەی نێش خەم تاکەی نەگۆش کەم ؟ (ل ٥١)

یا :

دڵ چون دوکانچەی ئەعلای عەتاران

ڕەنگینەن جە خەم فیراق یاران

خالق وجودم جە خەم سرشتەن

تاس تالعم هەر وەخەم ڕشتەن (ل ٥٣)

یا :

موغەنی ساتۆیچ نۆبەتەن دەی دەی

پەی ئیمشەو نەبۆ سەدای تۆپەی کەی ؟ (ل ٥٥)

یا :

شانای تای توغرای زوڵفی تەتاران

هامرازو هامدەم دیدە خوماران (ل ٧٥)

وەهەروەها لە چەندین بەیتی‌تردا هەست بەوە ئەکرێ کە کارمامزی ڕۆحی میرزادەم‌بە چۆڕاوگەی بەفری شاهۆی هونەری مەولەویەوە ئەنێت وتاسەی تینویەتی ئەشکێنێ .

٥ ـ مەلا عەبدولخالقی کۆڵەسارە ، نازناو ( حەزین ) . بە داخەوە شتێک لە بارەی ژیانی ئەم شاعیرەو شاعیری دوای ئەم ، مەلا مستەفای دۆڵاوی (مەحزوون ) نازانم و گەلێکیش سۆراخم کرد بەڵام تائێستە هیچم دەست نەکەوتوە ، تەنیا یەکی چەند پارچە

شیعرێک نەبێت ، ئەویش لە نوسخەیەکدا کە شاعیری دووەم نوسیویەتیەوە ئێمەیش لەمکتێبەدا گەلێ سودمان لێ وەرگرتوە بۆ مەولەوی . ئەم نوسخەیە ناوبەناو شیعری ئەم دووشاعیرەی تیایەوهاوڕێش بوون . لە شیعردا هەردووکیان دوو قوتابی قوتابخانەکەی مەولەوین و وایەکی شیعرێکیان پێش چاو ئەخەم .

بلێسەی ئایر نەدڵ خێزاوە
لافاوی ئەسرین نەچەم ڕێزاوە

سەرتەڵەی عەیشم هەم تەم کەردەوە
وەڵگی داری زەوق دڵان بەردەوە

هوناوان نەهەور دیدەم واراوە
ئەشرەفیی ڕوخسار وەمس فاڕاوە

دووریی ئازیزەن دڵ ماتەم وەردەن
یام قاسید نامەی ( مەحزوون ) ئاوەردەن

یاوا پێم نامەی شیرین ئوسلوبت
مەکتوبی قەڵەم نەعام مەرغوبت

دڵشاد بی وەشاد دڵشادم کەردی
پەشێویی ماتیی دەروونمبەردی

خەرمانی خەمان یەکسەر دای وەباد
دەک بێ بەلا بای عومرت بۆ زییاد

ئیزهاری ماتیت جەماتیم کەردەن
یانی جەماتیم پەشێویت بەردەن

بەڵێ چرای شارئەلەستم گریان
بەرگی ماتەمی ی وەباڵام بڕیان

جە چەرخەن جە چەرخ هەناسەی سەردم
دایم مەلولم چون بەردی هەردم

دودی ئاە نە چەرخ سەما ویەردەن
سەیلی ئەسرینم ماهی تەڕ کەردەن

ئازیز تا فەڵەک چەپ گەردییش کارەن
بارخانەی خەمان وەدڵان بارەن

بەڵام وەڵگەکەی ( حەزین ) بێ تاوان
وەتیغی دەستم کاوان چون کاوان

٦ ـ مەلا مستەفای دۆڵاوی ( مەحزوون ) .

ساقی ئامانەن خەیلێ غەمبارم
سا دەخیلم دەی خاس کەی خومارم

جامێ بدەر پێم بەو لەنجەکەی وێت
نەیچی تۆیچ دەخیل وەپەنجەکەی وێت

موغەنی ئامان هۆردەر سەدایێ
جفت کەوە نەیچی نەغمە و نەوایێ

هەردووتان وەهەم بسازان سازان
بنیشین وەهەم چون ئاوات وازان

تۆ وەسەدای نەی ئەو وەنەغمەی خۆش
ڕیشەی دڵ خاس خاس وەهەم بکەن جۆش [1]

٧ ـ پیرەمێرد.: دیوانی چاپکراوی هەیە ، بۆیە بە پێویستی ئەزانم خوێنەر خۆی بچێتەوە سەری ، نەک من لێرەدا باسی لێوە بکەم .

٨ ـ گۆران : ئەمیش دیوانی چاپکراوی هەیە لە هەندێ لە شیعرەکانیدا زۆر بەئاسانی هەست بەدنیای مەولەوی ئەکرێت ، بە تایبەتی لە ( پیاهەڵدانی سروشت و شایی و شیوەن )دا. لەم بارەوە ئەتوانین گۆران بە زیرەکترین قوتابی ئەمقوتابخانەیە دابنێین کەوەستایانە توانیویەتی شوێن پێی مەولەوی هەڵبگرێت .

٩ ـ دکتور سدیق مفتی زادە ( ١٣٣٤ ـ ١٤٠٥ ) .

ئەم پیاوە خوێندەوارە هێندە عاشقی مەولەوی بووە ، ماوەیەک لە تەمەنی خۆی داناوە بۆ لێکۆڵینەوەی دیوانەکەی وکاتی خۆی بە یەکێک لە مەولەوی ناسان ناوبانگی دەرکردووە .

ئەم بەرهەمەی لە سەرمەولەوی لەم ساڵانی دوایی‌یەدا لە لایەن (سۆران سنەیی) یەوەبە چاپ گەشت،هەرچەندە نازانین بۆچی ناوی دکتوری لە سەردیاری نەکردووە؟.

لەگەڵ ئەو خۆ خەریک کردنەیدا بە مەولەوی‌یەوە لە ژێر چەتری کارتێکردنیدا ئارامی گرتوەو لە خوێندنەوەی شیعرەکانیدا جێ پەنجەی هونەری مەولەوی دیارە . بۆ نمونە با ئەم بەیتانەی لە شیعری ( شەماڵ ) بخوێنینەوە .

وەبۆی هەرگوڵێ دەماخ چاخ کەردە
وەشنۆی کاوان دڵ پەرداخ کەردە

سێراو جە سافی تافی شەتاوان
سەروەش جە نەشئەی شاخەی وەفراوان

---

١ - لە ژێر ئەم شیعرەدا مێژووی ١٣١٣ نوسراوە.

نەتۆی چین زوڵف یاران ویەردە
پەردەی شەو نەرووی سەحەر لابەردە

لەبەیتێکی تریدا ئەڵێ :

فەڵەک وەبەختم مەگرەوۆ زارزار
مەڕێزنۆ ئەسرین چون هەوری وەهار

ئەم بەیتە لە ژێر کارتێکردنی ئەم بەیتەی مەولەویدایە .

هەوری نەوزارزار کڵاو ئەوکڵاو
مەگێلۆ ، ئەسرین مەڕێزو وەتاو . (لە ١٦١ دیوان ) .

لە شیعری ( یادی دۆس )دا ئەڵێ :

کەفتەبیم نە گێج دەریای مەهجوریی

مەولەوی ئەڵێ :
کەفتەبیم نە گێج دەریاکەی دووریی (ل ١١٥ دیوان )

یا لە بارەی ئەو نامەوە کە بۆی هاتوە ، لە هەمان شیعردا ئەڵێ :

دڵ وەرووی زامان کۆنەو نۆش ساوا
مەولەوی ئەڵێ :
دڵ وەمەردومەک دوو دیدەش ساوا (ل ٣٠٠ دیوان )

لە شیعری ( قیبلەم با وەس بۆ )دا ، دیسان جێ پەنجەی مەولەوی پێوە دیارە .

ئەڵێ : تاقم جه یاران ، جفتم چەنی خەم

مەولەوی ئەڵێ :

تاجه ( داخی ) تاق ، جفت خەمەنان    (ل ١٣٠ دیوان )

هەر لەو شیعرەدا ئەم بەیتانە ئەبینین

پەردەی دڵ وەخار دووریت بیەن رێش
مەیاونۆ وەگیان هەرساتێ سەد ئێش

سەروەڵگ نەمام حەیاتم زەردەن
چونکە زووخاوی دەردی تۆی وەردەن

...

هەرچەن ئیستیغنا پەی تۆ عادەتەن
رەویەی چون منیچ هەر ئیرادەتەن

ئەگەر تەوازوع تۆ ئیزهار کەری
شێوەی گەورەیی وێت جا باوەری

...

جارێ رەحمێ خەیر وەدڵ باوەرە
پەردەی بێ مەیلی جه بەین لابەرە .

ئەمانە هەندێ نمونە بوون لە باسی کارتێکردنی مەولەویدا لە سەر شاعیرانی هاوچەرخ و دوای خۆی . ئێستەش لەگەڵ ئەمانەدا پێم خۆشە مەولەوی لەم پارچە شیعرەی ئایەتوڵڵا مەردۆخدا دیاری بکەم ..

کاتی خۆی کە دکتور سەعید خانی کوردستانی کتێبی ( نزانی ) ئەنوسێ و بە دیاری

ئەینێرێ بۆ ئایەتوڵڵا ، ئەمیش دوای پەسەندکردنی ئەم نامە شیعریەی بۆ ئەنێرێ :

بەیتی یەکەم :

ئارامی دڵەی پڕ جە خارەکەم
دەرمانی دەروون پڕ ئازارەکەم

مەولەوی ئەڵێ :

تەسکینی دڵەی پڕ جە خارەکەم
دەرمانی زامان بێ قەرارەکەم ( لە دیوانەکەیدا نیە )

بەیتی دووەم : نامەی ( نزانی )ت وەلای من یاوا
بۆسام و نەڕووی دوو دیدەم ساوا

مەولەوی لە هەمان شیعردا ئەڵێ :

نامەکەت کیاست وەلای من یاوا
پەیاپەی نەڕووی دوو دیدەم ساوا

بەیتی چوارەم :

یاسای دڵداریت وەجێ ئاوەردەن
بووچک نەوازیت پاوەجێ کەردەن

مەولەوی :

ڕەویەی بزورگیت وەجا ئاوەردەن
غەریب نەوازیت وەپیشە کەردەن ( ل ۲۱۹ دیوان )

بەیتی حەوتەم :

کوڵەی دڵەکەت جۆش ئاوەردەبۆ
کزەی دووریەکەت قسە کەردەبۆ

مەولەوی لە هەمان شیعردا :

دەروونت وەکوڵ جۆش ئاوەردەبی
کزەی دووریی وێت ئیزهار کەردەبی

بەیتی نۆهەم :

دێوناتەو دودی کوورەی دەروونم
کولناتەو زامان دڵەی پڕ هوونم

مەولەوی لە هەمان شیعردا

دێوناتەوە دەرد کوورەی دەروونم
کولناتەوە زام دلەی پڕ هوونم

میسرەعی یەکەم : بەیتی یانزەهەم

هەرسات دیم وەچەم نەوهاڵی باڵات

مەولەوی ئەڵێ :

هەرگا دیم وەچەم شێوەی باڵاکەت   ( ل ٢٢٠ دیوان )

بەیتی سیانزەهەم :

ئانە رۆژ جەژن شادمانیمەن
ئانە نەو وەهار زیندەگانیمەن

مەولەوی :

ئانەگرد وەشی و شادمانیمەن
ئانەگرد مایەی کامەرانیمەن (ل ٢٢١ دیوان)

بەیتی چواردەهەم :

وەرنە ئیسە من هوون دڵ وەردە
گیانم سەنگین بار تەن خەزان کەردە

مەولەوی :

وەرنە ئیسە من هوون دڵ وەردە
قامەت سەنگی بار خەمان خەم کەردە (ل ٢٢١ دیوان)

بەیتی پانزەهەم :

جەرگم وەمەودای دووریت بیەن ڕێش
بێ درۆ ئازیز ( نزانی )م پەی چێش

مەولەوی :

دەروون وەمەودای دووریت بیەن ڕێش
هەی خاکم وەسەر سەوقاتم پەی چێش (٢٢٠ دیوان)

## ـ شیعری مەولەوی و بۆنی خاک ـ

لە گۆڤاری سروەی ژمارە ( ١٢١ )دا کاک محەممەدی حەمەباقی وتارێکی لەسەر مەولەوی بڵاوکردۆتەوە کە بە پێویستم زانی لێرەدا هەڵوەستەیەکی لە سەر بکەم ، چونکە خۆم لە بەر نامەمدا هەبوو کە وتارێ لەم بارەوەبنوسم و لەم رەخنەیەدا ناوەرۆکی وتارەکەم دەرئەکەوێ .

دوای ئەوەی دووجار وتارەکەم خوێندەوە بۆم دەرکەوت کە ئەکرێ وتارەکە بکەین بە دوو بەشەوە ١ - هەندێ لایەنی پرشنگداری دەربارەی مەولەوی تیایەو ئەوە بەجێگەی خۆی ئەبێ دەست خۆشانە بە کاکە حەمە بڵێین بۆپەی بردن بەولایەنانەو بەڵگە هێنانەوە لە سەریان .

٢ ـ هەندێ لایەنیشی تێدا بووکە نەمتوانی لە سەریان ڕانەوەستم ، چونکە کپ و کزن و لە کاکە حەمە چاوەڕێ نەئەکرا بەوشێوە بە سەریاندا ڕەت ببێ . وەکو :

**یەکەم ، کاکە حەمە نوسیوویە :** لەماوەیەکی کورتی تاقی کردنەوەی شیعریا . واتە مەولەوی ماوەی تاقی کردنەوەی شیعری کورت و کەم تەمەن بووە . بەڵام دیارە پێچەوانەی ئەمە ڕاستە ، ئەمە بۆشاعیرێکی وەکو (سوارەی ئێلخانی زادە ) بگوترێ دروستە ، چونکە لەگەرمەی‌کارکردندا بوو لە تەمەنی ( ٣٣ ) ساڵیدا کانیاوی ژیانی وشکی کردو کاروانەکەی بە ناکاوی بە جێ هێشت . وەهەروەها کەسێکی وەکو خوشکە ( ژیلا )ی جوانەمەرگ .

بەڵام مەولەوی ( ٧٩ ) ساڵ ژیانی بەسەر بردووە ، جا ئەگەر لە بیست ساڵی‌یەوە دەستی کردبێ بە شیعر وتن ، کە لە هەندێ لە شیعرەکانی زەمانی فەقێ‌یەتیدا دیارە هەر لەم تەمەنەو بەرەو خوارتردا وتونی ، ئەوا ( ٥٩ ) ساڵ خەریکی تاقیکردنەوەی شیعر بووە ، کە ئەمەش تەمەنێکی کەم نیەو بگرە زۆریشە.

**دووەم ، نوسراوە :** چ لای جەماوەری هەژاری ناوچەدواکەوتووەکەی ، چ لای

پیرو پیرزادەکانی و ، چ لای زانایان و ، چ لای میرانی بابان و ، بەتایبەتیش لای میرانی ئەردەڵان و تەنانەت لای سەرانی قاجاریشەوە ، بەکەسێکی زاناو ڕەوشت بەرز و خاوەن هەڵوێست و دڵسۆز ، سەیری کراوەو، جێگەو ڕێزی تایبەتی هەبووەو ، پلەو پایەی مەزنیان بۆداناوە .. هتد.

ئەمەی کاکە حەمە فەرموویەتی ڕاستەوگومانی تیا نیە ، بەڵام من پێم خۆش بوو کاکە حەمە لەم ڕیزەدا پاشاکانی جافی لەبیر نەچوایە ،کە ئەمانیش بە هەمان چاوو بگرە زیاتریش سەیری مەولەویان کردووە. پەیوەندیی گیانی بەگیانی مەولەوی بە (محەممەد پاشاومەحموود پاشاوقادر بەگی کەیخوسرەو بەگەوە ) نابێ لە بیر بکرێت .

سێیەم ، نوسراوە : دیسان هەرئەم شازادەیە ( واتە غوڵام شاخان ) لەگەڵ ئەوەش دا کە لە باوەش دایکیدا گەورە بووە ، سەدان فرسەخ لەزێدو زمانی مەولەوی یەوە دوورە کەچی ئەوەندە عاشق وهۆگرو سەراسیمەی شیعری مەولەوی بووە ، نەک هەربەدیالیکتی ( گۆرانی ) ، بەڵکو سەیر لەوەدایە ، بەشێوە زمانی ناوچەی ( تاوگۆزی ) شیعری لەگەڵ مەولەویدا ئاڵ و گۆڕ کردووە .

غوڵام شاخان ئەوەی تا ئێستە دیاربێ شیعری بە فارسی زۆرترە ، واتە بە زمانی دایکی کە لە کۆشیدا پەروەردە بووە . بۆ بەشەکەی زمانی باوکیشی بەدووزاراوەی کوردی شیعری وتوە ،بەڵام شیعرەکانی ـ ئەگەر هەرئەوەی وتبن کەدیارن ـ بەزمانی کوردی کە من و لە چەند شیعرێ تێناپەڕن . شیعر بە هەورامی وتن باوی قەڵەمڕەوی ئەردەڵانیەکان بووە ، ئەوە هیچ و بە شێوەی جافییش من پێم وایە دوای تاقی کردنەوەکەی مەولەوی کە (العقیدەی المرضیە )ی پێ نوسیوە، یا شیعری ( تۆپڵاخەی دووکەڵ هیجران دڵبەرل ١٣٤ دیوان ) لە هەرێمی ئەردەڵانیش دا بووە بە باو ، فخرالعلماو سەرعی ش دوو شاعیری ئەو دەورەن

وبەهەمانزاراوە شیعریان وتوە ، ئیتر غولاّم شاخانیش لەو بازنەیە بەدەرنیەو ئەمیش لەومەیدانەدا خۆی تاقی کردۆتەوەو ئەو دوو شیعرەی نوسیوە .

پاشان ئەبێ ئەوەش بڵێین کەناوچەی تاوگۆزی شێوە زمانی تایبەتی خۆی نیە، بەڵکو جافی یەو لە هەموو ناوچەکانی ( جوانرۆ ، هەڵەبجە ، شارەزوور ، کەلار ، دەربەندیخان )دا برەوی هەیەو بە تەواوی لە ئەردەلانیەوە نزیکە ـ جگە لە هەندێ واژەی تایبەتی هەردوولا نەبێ ـ ئەمە جگە لەوەی سالاّنە جافەکان چەند مانگێکیان لەناوچەی سنەدا بەسەربردووە ، بەهۆی گەرمیانکوێستانکردنەوە . کەواتە غولاّمشاخان نەک هەر نزیک بووە لەشێوە ئاخافتنی مەولەوی ، بەڵکو ئەتوانین بڵێین یەکێکن .

چوارەم ، نوسراوە : بۆ وێنە شاعیرێکی پێشینەو سەودای نیشتمانی وەک ( ئەحمەدی خانی ١٦٥ ـ ١٧٦ ) سەرباری ئەوەش کە شاعیرانی ترمان لەمەوە فێری دڵداری خاک بوون ... کەچی لە تێکرای داستانی (مەمو زین )ە کەیدا ، کەداستانێکی خۆماڵییانەشە ، بەلاّملەباس و خواسی پەیوەندی کۆمەلاّیەتی و داب و نەریتی خۆماڵییاندا ، ئەگەر لەگەڵ شیعری شاعیرانی دراوسێکانماندا تێکەڵ بکرێ ناناسرێتەوە .

لەگەڵ ڕێزمدا بۆ ئەم ڕایەی کاکەحەمە ، خوا هەڵناگرێ ( خانی ) زۆرخۆماڵیانە بابەتەکانی ڕازاندۆتەوە ، شاکارەکەی دکتور عزالدین مصطفی رسول کە خۆی وەریگێڕاوەتە سەرزمانی عەرەبیی هاوسێمان و زۆر بەئاسانیش عەرەبەکان هەست بەوە ئەکەن کە ئەو داب ونەریتانە کوردین و هیچی بەلای داب ونەریتی عەرەبدا ناچێ . پێموایەبۆ هەر زمانێکی تریش بە هەمان شێوەیە ( جەژنی نەورۆز و داخوازی زین و ناردنی هەجبێ وشایی تاژدین وستێ و ڕۆشتنی میربۆ ڕاو وشیوەن و بەیەک گەشتنیزاواو بوک ) بەتەواوی کوردانەن ، بەلاّم چونکەئێمە لە

لەهجەکەی مەولەویەوە نزیکین و ڕۆژانەدوور ونزیک لەگەڵیدا ئەژین و لەبەرامبەر ئـەمەدا لە لەهـجەکـەی خـانیەوە دووریـن، ئـیترپێمان وایـە ئـەمەی مـەولەوی خۆماڵیانەیەو ئەونە ..!!

هەرچەندە منیش بۆ خۆم لەو هەوایەدا ئەژیم ، بەڵام کەوەرگێڕانەکەی هەژاری خوالێخۆشبو ئەخوێنمەوە ئیتر ئەوەم لەسەردا نامێنێ ، چونکە بەڕاستیبابەتەکان خۆماڵیانەن .

پێنجەم : کاکە حەمە وای دیاری ئەکات کە شیعرەکانی مەولەوی لەهی خانی و حاجی قادری کۆیی و نالی و سالم نیشتمانیترن .

لەوەداکە شیعرەکانی مەولەوی زیاتر بۆنی خاکیانلێ دێ .. ڕاستەوقسەی تیا نیە. بەڵاملەلایەکیترەوە مەولەوی قەرزاری نیشتمانەکە ئەوشاعیرانە بە هەڵوێست قەرزەکەیان داوەتەوە.

نیشتمان لەورۆژەدا هەر ئەوەی لە مەولەوی نەئەویست کەشیعرەکـانی بـۆنی خاکیان لێ بێت ، ئەوەشی لێ ئەویست کە لە تێک شکـانی ئـیمارەتی بـاباندا سۆزێکی بکردایە ، وەکو ئەو شیوەنە بەکوڵەی نالی و سالمکردوویانە. جا ئەگەر مەولەوی ئەوێ‌ی بەنیشتمانی خۆی نەئەزانی ئەی بۆچی دواپلەی خوێندنی لە سلێمانی تـەواوکـردوئیجازەی مـەلایەتی تـیاوەرگرت ؟ . ئـەی بـۆچی بـووە هاوخوانی ئەحمەد پاشای بابان و ؟ ئەی بۆچی کۆمەککردنی عەبدوڵلا پـاشا قبوڵ ئەکات ؟ ئەو عەبدوڵلا پاشایەی‌کە شێخڕەزا واتەنی (لەشکری والی سنەی شڕکرد ) . ئەی بۆچی پەیوەندیی ڕۆحیی لەگەڵ ( کاک ئـەحمەدی شـێخ)دا دروستکرد ؟ ..

یا ئەمەش بەولاوە ، خـۆنیشتمان ئـەوەی لێ ئـەویست کـەبۆ ئـەو چـەندین گیروگرفتەی ئیمارەتی ئەردەڵان دڵۆپێ فرمێسکی بڕشتایە ، ئەمەلەکاتێکدایە کە

کوڕی مەحموی یار وەیسی هاوڕێی بەگوڵلەی ویێل ئەکوژرێ ، لە چەند شیعردا شین و شەپۆڕی بۆ ئەگێڕێ .

ئەمانە نیشانەی ئەوەن کەئاسۆی بیر کـردنەوەی هـاوچەرخـیانەی مـەولەوی زۆربەر تەنگ بووە ، بەڵام هی خانی ونالی و سالم و حاجی فراوان بووە وکۆستی گەورەی نیشتمانیان هەست پێکردووەو بەدڵ وگیانلەگەڵیدا ژیاون .

وەئەگەر بێ پەیوەندیی بوونی لەگەڵ نالی وسالمدا لە سەر ئەوە بووە کە بە شێوەی عەروض شیعریان وتوە . هەروەکو کاکە حەمە لەم بارەوە ئاماژەیەکـی کردووە ـ ئەی خۆسەرجەم شیعرەکانی شێخی بهاءالدین بەهەمان شێوەن و بە فارسییش وتراون ، ئەی بۆ لەگەڵ ئەمدا دڵی گەرد نەیگرتوە ؟ یا لەگەڵ شێخی ( ضیاءالدین ) داکە چەند دانەیەک شیعری کوردی هەیەو ئیتر هەموو دیوانەکەی عەرەبی و فارسییەو بەهەمان وەزنن کەمەولەوی دڵی پـێیان نـاکـرێتەوە . خـۆ ئەمشێخەو سالمیسنە جووتە دەست پێشکەری ئەوەن کە لەسنوری جوگرافیای ئەردەڵاندا بەرنامەکەی مەولەویان شێوانـدو شـیعری کـوردییان بـە شـێوەی عەروض وت . ئەی بۆ لەبەرامبەرشێخی ( ضیاءالدین ) دا دڵی گەرد نەیگرت ؟ بەڵکو بە پێچەوانەوە تا دوا ڕۆژەکانی تەمەنی هەر دڵبەندی ئەم شێخە بووە . ئەگەر مەولەوی ئەو بەرنامەیەی خۆی ئەوەندە بەلاوە گرنگ بووە .ئەبوایـە دڵـی لە شێخی ( ضیاءالدین ) هەڵکەندایە ، با هەزار جار پیرزادەشی بووبێ ، چـونکەبە پەیڕەوی کردنلە قوتابخانەکەی نالی بناغەی قوتابخانەکەی ئەم تێک ئەدات و شۆڕش بە سەر بەرنامەکەیدا ئەکات . ئەمە شیعرێکی شێخی ناوبراوە ، لەبەرئەوە چونکەتائێستە ڕۆشنایی نەدیوە بە پێویستمزانی لێرەدا بڵاوی بکەمەوە .

شەرعی ئەنوەر ڕەهبەرمبێ ، پشتیوانم بۆچییە ؟
شێخی جاهیل ، پیری غافڵ ، قەڵتەبانم بۆچییە ؟

مەحفەل ئارایی سەفای شاهیدی زیکری خەفی
های و هوویی سەرسەری و زیکری زەبانم بۆچی‌یە ؟

( ڕیشەکەی هەوساری تەمەع )بێ ، سوبحەدانەی فاقەبێ
هەردوو ئەسپابی ڕیان من ئەین و ئانم بۆچی‌یە ؟

عیززەت و زیللەت پەرستن سفڵەیی و بێ عاری‌یە
من کەبێ قەیدو شەرەف مام خان و مانم بۆچی‌یە ؟

تێ گەییشتن دوورنیە ، فەزڵ و هونەر مەئدوونیە
سەرف و نەحوو مەنتق و شەرح و بەیانم بۆ چی‌یە ؟

بانگی نۆشانۆشی ئەحبابان لەگوڵشەن‌دانەبێ
چەهچەهەی کەبکان و نەغمەی بولبولانم بۆچی‌یە ؟

سەبزە پۆشانی چەمەن ئەمڕۆو سبەی ڕوو زەرد دەبن
بەرگی عاری و فاخری و ڕوتبەو نیشانم بۆچی‌یە ؟

خاکپایی عالیمان و عامیلانی مەدرەسەم
واعیزی پڕ گۆ لەقەندو نان و خوانم بۆچی‌یە ؟

لالەیی نوعمانی دنیا داغی باغی باغی‌یە
( فەوزیا ) بێ یاری سادق ، گولستانم بۆچی‌یە ؟

ئایا مەولەوی لە بەرامبەر شیعرێکی واداکە ئەتوانین ناوی بنێین کۆدیتایەک بە سەر ڕێبازەکەیدا چ هەڵوێستێکی هەبووە ؟ .. لەوەڵامدا ئەبێ بڵێین هیچ دیار نیەو تاهاتوویشە شێخ بەلایەوە خۆشەویستتر بووە ، ئایا ئەمە لەگەڵ بۆ چوونەکەی کاکە حەمەدا جووت ئەبێ ؟ .

شەشەم : کاکە حەمە لەوتارەکەیدا سنوورێکی جوگرافیای کێشاوە لە (چەمی زەڵم )ەوە تا ( قوللەی وەیس ) کە گوایە کۆماری مەولەوی یە و خەیاڵی مەولەوی شورەی بە دەوردا چنیوە.

بەڵام ئەم کارە زووتر بەرلە مەولەوی کراوە . بێسارانیش لە هەمان جوگرافیادا قەتیس بووەوئەگەر واژەگەلی (سۆسەن خاڵ ، ڕێحانە ، چنوور ، بەڕەزا ، وەنەوشە ، کۆسالان ،کەڵەدەر ، عەوالان ، سەرەواڵە ، کاوان ، تافی دیۆەزناو ، نسار ، ڕەز ، بەفراو ، قەڵوەزە ، بێساران ، چەمەری ، یوسف = یوسف یاسکە ، دەردین = مەولانا دەردین ، باباشێخ ، شنۆ و شەماڵ ) لە دیوانەکەی دەربهاوێژین ، شتێکی وەهای پێ نامێنێتەوە .

وەلی دێوانەش کە هەر بەر لەمەولەوی ژیاوە بە هەمان شێوەیەو ئەگەر ئەم واژانەی لێ بسەنینەوە ئەوا هەگبەکەی خاڵی ئەبێتەوە ( شەم ،خەسرەو ، ڕەنجوری، عێلی مرادی ، جاف ، ساراڵ ، گەرمیان ، ئێلاخ ،لەیلاخ ، سیاماڵ ، هەوار ، تەڵمیت ، سەرکڵاوان ، کۆچ و کۆچبار ، شەتاو ، کاوان ، بەڕەزا ، چنوور ، سۆسەن .. هتد ) .

کەواتە نابێ ئەو کارە هەر بەهی مەولەوی بزانین و ئەبێ ئاگامان لە شیعری شاعیرانی تری نێوسنووری جاف و ئەردەڵان بێ کە زۆربەی هەرەزۆریان لە هەمان جوگرافیادا ئەخولێنەوە .

حەوتەم : کاکە حەمە لەوتارەکەیدا وای دیاری ئەکات کە ( باس و خواسی

پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و داب ونەریتی خۆماڵیانە ) لای مەولەوی کوردانەترن تالای خانی . من پێم خۆش بوولەمبارەوە کاکە حەمە چەند نموونەیەکی بهێنایەتەوەکە دیوانەکەی مەولەوی پڕیەتی . هەروەکو ( ١٢ ) نموونەی لە سەر (با) و ( ٢٤ )ی لە سەر ناوی شوێنەکان هێناوەتەوە . بەمەش باخچەی لێکۆڵینەوەکەی ڕازاوەتر ئەبوو ، ئەمەش شتێک نیەکە بکرێ بەژێر لێوەوە ، بەڵکو پێویستە لەگەڵ باسی مەولەویدا بایەخی تایبەتی بەمبابەتە بدرێ ، چونکە مەولەوی وەستایانەدیواری ئەم لایەنەی هەڵچنیوە. بۆ نموونەباچاوێ بەمبەیتانەدا بگێڕین .

**ئاخ قووەی زەمین دەروونم کەم بی**

**بووڵەکەی سفتەم سەرەڕای خەمبی ( لە ٨٧ دیوان )**

وەشاندنی خۆڵەمێش بەسەررێگادا نەریتێکیناوکوردە و بۆ ئەوەش ئەیوەشێنن چونکە ئیتر ئەورێگایەگیای تیا سەوز نابێ و بۆ هاتوچۆکردن ئاسانە . لەدێدا دیومانە زۆرتر ئەمکارە لە سەرەڕێی نێواندێ و کانیدا ئەکرێ .

یا :

**باڵا کەردەوە مەیل ئەو لای پەستی ی**

**وردیکڵانەن دەروازەی هەستی ی ( ل ١٠٦ دیوان ) .**

دەرگای نزم و بچوکدانان لەماڵاندا نەریتی هەورامانە بە تایبەتی ، چونکە مەڵبەندێکی ساردەدەرگای ماڵان بچوک دروست ئەکرێ ، بۆ ئەوەی لەکاتی کردنەوەدا هەواکەم بچێتەژوورەوە ، ڕەنگە ئێستە بە هۆی پێشکەوتن و زۆر بوونی ئامرازی گەرم کردنەوە لەهەندێ گوندا بەمشێوە نەمابێ . بەڵامئەوساو ئێستەش لەهەندێ دێدا باوبووەو باوە .

یا :

هەرچی بوینوون شێوەی تۆ پێشەن
دڵ وەهەتیتەی حەسرەتدا کێشەن (ل ۲۳۵ دیوان).

هەتیتە = ئەو تەختە دارەی کە شاڵی لێوەئەپێچن بۆ ئـەوەی دەق بگـرێت، ئەمەش تایبەتی هەورامانەو مەولەوی هونەرمەندانە ئەو واژەیەی بەکار هێناوە.

تای چینی چنوور پای تافی بەفراو
هەروەتۆ مەکەفت نەدەورەی کڵاو (ل ۳۵۵ دیوان)

ئەم بەیتەش هەرنەریتێکە و لەسنووری جافەتی و هـەورامـاندا زۆر بـاوە، پیاوان و تەنانەت ژنانیش چڵێ چنوور یا ڕێحانە یا پونگە لە سەرلاجانگ ئەکەن بە نێوان سەریان و کڵاو یا پوشینەکەیاندا بۆ ئەوەی بە دەم ڕێگا بـڕینەوە بـۆنی خۆشیان پێ بگات، ئەمە جگە لەوەی کەدیمەنێکی جوانی هـەیە. یـا بـڕوانـە شیعری (شنەفتم دووربالەیل زوکامشەن) ل ۳۲۲دیوان.

ئەمانەو هەروەها نمونەی تریش کەئەگەر دیوانەکەی بگەڕێیت زۆری تێدایە و بابەتێکی بە پێزیشە بۆ لە سەر نوسینی.

هەشتەم، نوسراوە: نیشتمان بە هەموو کەژو کوێستان و گـەرمیان و ڕووبـارو قەڵبەزو گوڵ و سروەو درەخت و مرۆڤیەوە، لە هەموو شیعرێکی مەولەویدا، لە هەموو بەیتێکی مەولەویدا، بەڵکو لەهەموو پیتێکی مەولەویدا، بانگمان ئەکەن و، هانمان ئەدەن، خۆشمان بوێت.

لە خوێندنەوەی مەولەویدا ئەتوانین بڵێین: گەلێ (نەک هەموو) شیعرێکی مەولەوی، گەلێ بەیتی مەولەوی، گەلێ واژەی (نەک پیتی) مەولەوی بانگمان ئەکەن بۆ ئەو مەبەستە .....

چونکه مەولەوی گەلێ شیعر و بەیت و واژەی تری هەیە کە نیشتمانیان تیا دیار نیەو بابەتێکی گشتین و ئەگەر بەزمانی تریش وەربگێڕرێن ئەوا هەست بەو مەبەستە ناکرێ کە جەنابی کاکە حەمە فەرموویە. بۆ نمونە بڕوانە شیعری (١) پیتی (بێ) ئەگەر لە بەکوردی نوسراوەکەی دەری بێنین لەم (٢٧) بەیتەدا یەک واژەی تیا نیە کە بۆنی خاکێکی دیاری کراوبدات. (نمونەی شیعری تری لەمبابەتە هەیە).

یا ئەمبەیتانە بخوێنینەوە بۆماندەرئەکەوێ کە مەولەوی لە جوگرافیاکەی دەرچووە وشتێکی گشتیمان ئەدات بە دەستەوە.

هەرماهێ نەو بۆ حالْم پەشێوەن

چون هیلال شێوەی ئەبرۆی تۆش پێوەن (ل ٢٣٥ دیوان)

...

سولەیمان جاهێ ، جام جەم نیگاهێ

سکەندەر شاهێ ، دارا دەرگاهێ (ل ٥٠٧ دیوان)

...

ئۆسای بلوور بەند پەنجەرەی کاوان

ئاینە سازیش وست ئەو شەتاوان (٥٣٨ دیوان)

ئەم دیمەنەش لە هەموو سەرزەمینێکی وەکو لای خۆماندا هەیە (نمونەی تر زۆرە).

یا ئەمواژانە چەند دوورن لە نیشتمانی مەولەوی یەوە :

هەر ڕۆ جەیحوونێ مەڕێزۆ نەچەم (لە ٢٦٧ دیوان)

...

ڕەفیقی سەرحەد ئەقلیمی دەردان

ناخودای کەشتیی بەحرەکەی هیجران (ل ٢٣٧ دیوان)

لەت لەتی جەرگم عومان عەینەین
پڕ کەردەن ، بڕیان بوخاری بەحرەین

( نمونەی‌تر زۆرە )

نۆهەم ، نوسراوە : مەولەوی ئەو قوتابخانە شیعرییە ( عروز ئامێزە عەرەبییە )ی نالی ، بەکۆدێتایەکی نامۆو ناوەخت زانیوە ، بۆسەر شێوە زمانی گۆرانی ..

دیسانەوە لەگەڵ ڕیزمدا بۆ کاکە حەمە ، زۆردەمێک بەرلەنالی ، هەر لەسنوری گۆران وبەزمانی گۆرانی (سەیدی یەکەم ) و ( شێخ شەهابی لۆنی ) بەوەزنی عەروز شیعریان وتوە . لەبارەی سەیدی‌یەوە هیچ ناڵێم ، چونکەبڕێک لە شیعرەکانی چاپ بووە . بڕواننەدیوانی سەیدی ـ ئامادەکردنی محەممەد ئەمین کاردۆخی . هەرچەندە لەگەڵ سەیدی یەکەم تێکەڵ کراوە .

دەربارەی شێخ شەهابیش ( ١١١٢ ـ ١١٨٥ ) ئەوەی کە دیبێتم قەسیدەیەکی (٥٣ ) بەیتی ( بەهاریە )ی هەیە کەبەم‌شێوە دەست پێدەکات.

نەوبەهارا ،دڵبەرا ،وەش بۆ بەئابی دڵبەریی
فەسڵی گوڵ گەشتی چەمەنها، سەیری سەحرای ئەخزەریی

بای شەماڵ شەق شەق شکاوا تەختی یەخ بەندی چەمەن
چون امیرالمؤمنین‌کەرد ، فەتحی دەربی خەیبەریی

تا ئەڵێ :

لایەقەن یاران بگێران مەجلیسی شاهی‌ی چەنەش
تەکیەدان بەرمەسنەدی گوڵ چون مەلەک، حوورو پەری

بۆ (شەهاب )ت بۆ سەراپایش فیدات ئەی گوڵ بەدەن
فەسڵی سەیری تۆوەهارەن ،تۆ جەگوڵهاخاس تەری ..

شیعرێکی‌تری ( ٩ ) بەیتی هەیەکە بەم شێوە دەست پێدەکات :

جەتۆ عەفوەن ، جە من تاوان ، جە تۆ فێشتەر بەکێ نازم
فیدات‌بام شۆخی شیرین وەش ، ئەنیسی مەحرەمی ڕازم

تا لەکۆتایی‌دا ئەڵێ :

( شەهاب )ت پڕ خەم‌و خەستەن، زەعیف و زاروناجەستەن
سیاحەی تاری تۆ گەستەن ، ئەرێ هەی شای شەکەر ڕازم

شیعرێکی‌تری ( ٧ ) بەیتی هەیەکە سەرەتا وکۆتایی‌یەکەی بەم شێوەیە :

جەماڵێوەم‌دیەن یاران ، تەعالا سنعی ڕەببانی
مەلایک یا پەریزادەن ، بەوێنەی شکڵی ئینسانی

تا ئەڵێ :

دوو موشکین‌قەوسی ئەبرۆشەن ،ڕەوایی دڵبەریش دۆشەن
( شەهاب )ش پەی سیاپۆشەن ، خودا وینۆش بەئاسانی

وەهەروەها بەندە شیعری شاعیرێکی‌ترم لە لایە بەناوی (محەممەد )کە بەداخەوە ئەم‌شاعیرەتا ئێستە نەناسراوەولای کاک سەیید باقری هاشمیش لەکرماشان نمونەی شیعری هەیە ، شیعرەکانیشی دەهەجایی نیە ، لێرەدا بە هەلی ئەزانم‌کەئەم شیعرەی بڵاوبکەمەوە ،هەم بۆ نمونەی باسەکەو هەم بۆ ئەوەش کەدەرکەوێ تا بەڵکو ئەمەخوایە لەشوێنێکەوە بناسرێ .

دەبۆ لادێ وەلام ئەی بەرگوزیدەم
قەدەم بنیەر وەسۆمای هەردوودیدەم

دەبۆ عەیشم ، نیشاتم ، شادمانیم
دەبۆ ڕۆحم ، حەیاتم ،زیندەگانیم

دەبۆمایەی مەتای دنیاوو دینم
دەبۆ شادی و وەشی ڕووی سەرزەمینم
دەبۆ ئارامی دڵچەی بێ قەرارم
دەبۆ دەرمانی جەستەی دەردەدارم

دەبۆ هامرازی بێداریی شەوانم
دەبۆ نامت ڕەوای ویردی زەبانم

دەبۆ مەحبوبی دڵچەسپ وظەریفم
فریشتەی ( جنةالماوی )ی شەریفم

دەبۆ خەمخوارو دۆستم ،نازەنینم
دەبۆ فیکرم ، ڕەفیقم ، هام نشینم

دەبۆ شیرین زووانی وێڵ وڵاتم
دەبۆ خاوم ،خەیاڵم ،خەم خەلاتم

دەبۆ شای شەککەرین ڕازم ،دەبۆبۆ
دەبۆ جای نازی دڵوازم ،دەبۆبۆ

دەبۆ یاگەی خەمانم تۆنی ئەی دۆست
دەبۆ سۆمای چەمانم تۆنی ئەی دۆست

شەفا پەی ئێشی زامم تۆنی ئەی دۆست
کەلیمەی سوبح و شامم تۆنی ئەی دۆست

بینایی نوری دیدەم تۆنی ئەی دۆست
عەزیزم ، بەرگوزیدەم تۆنی ئەی دۆست

خودا زانۆ گییانم تۆنی ئەی دۆست
وەشیم ، شادیم ،ژیانم ، تۆنی ئەی دۆست

ئەگەر لادێ نەوینوت ئەلوەدامەن
چمان ڕۆمەڵخەزای ڕۆی کەربەلامەن

چمان پەیکانی کارییم هانەدڵ دا
چمان جەرگم مدەی لەت لەت وەچڵ دا

شەوان تک تک مەتکیۆ هوون جە جەرگم
ڕۆوان گوڵ گوڵ مەبۆ بەو هوونە بەرگم

بە مەرگی تۆ ئەوەن دڵ بێقەرارەن
ژیان تاڵەن ، مەواچی ژاری مارەن

زوان لاڵ بۆبە مەرگو تۆ قەسەم وەرد
بە مەرگو وێم گییانم ها جە دڵ مەرد

دەبۆ بارە شەفا پەیئێشی زامەت
وەگەرنە دیدەنت کەوتەن قیامەت

ئەگەر مەرگەن خەڵات ، ئەر زیندەگانی
ژیانم‌دەستو تۆن و وێت مەزانی

بینایی گوڵ جەمین و هەردوو دینم
بە تۆن گرد ئیختیاری مەرگ و ژینم

چەنی زوخاوی وێم زامم خەتەرناک
تۆ وەشبی دیدەنت ها ،بەردم ئەوخاک

کەواتەنابێ لەنالیەوە دەست پێ بکەین و زووتر کراوە ، بۆ ئەم‌شاعیری سێ‌یەمە ناتوانم بڕیار بدەم ،بەڵام دڵنیام مەولەوی شیعری بەو شێوەی (سەیدی ) و ( شەهاب ) دیتوە ، بۆیە ناکرێ بەو شێوەتێ‌یبڕوانین کاکە حەمە فەرموویە .

- مەولەوی و ڕەخنەی ئەدەبی -

ڕەخنە یا لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن هەر وەکو لەمێژووی ئەدەبیاتی جیهاندا تەمەنێکی درێژی نیەو یەکێکە لەتازە نەمامەکانی باخی ئەدەبیات . لە ئەدەبی کوردییشدا ئەوەندەی کەدیاری کرابێ تەمەنی درێژی ئەگەڕێتەوە بۆ دەست پێشکەریەکەی ئەدیبی گەورە ( شێخ نووری شێخ ساڵح )و بەدوای ئەمدا مامۆستایان ( ڕەفیق حیلمی ) و ( گۆران )هاتوونەتە مەیدانەوەو هەر یەکە و لە ڕێگەی خۆیانەوە چەپکە گوڵێکیان خستۆتە سەر ئەم مێزە.

بەڵام بەو پێیەی کەشیعر تاقانە بڵندگۆی ئەدەبی بووە و لەسەردەمێکی

دوورودرێژدا هەرخۆی تاکە سواری مەیدان بووەو بەشەکانی تری ئەدەب چاویان هەڵنەهێناوە ، واتە هەرچی مەرام و مەبەست و بیروبۆچوون بووە هەربەشیعردەربڕراوە ، پێویستە هەموو گەلانی جیهان بچنەوە سەرخوانی شیعر وبزانن لە تەمەنی شیعری گەلەکەیاندا پەیامی ڕەخنەهەیە یان نە. ئەگەر نیە ئەوە هیچ و ئەگەر هەیشە ئەوە ئەبێ ئەو شیعرانە کەباس لەڕەخنە ئەکەن و بۆن و بەرامەی ڕەخنەو ڕەخنەکاریی‌یان لێ دیت بیکەن بەمێژووی لەدایکبوونی ڕەخنەی گەلەکەیان .

ئا بەم پێوانەمێژووی کاری ڕەخنەیی لە ناو زۆر گەلەکانی جیهاندا وەکو ئێستەی خۆی نامێنێ و مێژوویەکی تر ئەچەسپێ . یانی ئێستە کەگەلە زیندووەکانی دنیا ئەدەبیاتی خۆیان نوسیوەتەوە و هەر یەکەو مێژوویەکیان بۆ ڕەخنەی ئەدەبی ی خۆیان داناوە. وەلەوە ئەچێ کەلە شیعری ئەو گەلانەش‌دا شیعری ڕەخنەیی هەبێت ،کەواتەئەو مێژووەی کەدایان ناوە ئەگۆڕێ . ئەگۆڕێ بەمێژووی ئەو شیعرە ڕەخنەییانە .

هەروەکو لەئەدەبی کوردیداکارەکە بەم شێوەی لێ هاتووە . واتەئەو مێژووەی کە دیاریمان‌کرد ئەگۆڕێ بۆزیاتر لەسەد ساڵ بەر لەئێستەو ئەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی شیعری مەولەوی تاوگۆزی .

یانی بە پێوانەیەکی ئەدەبی مەولەوی ئەبێتە یەکەمین ڕەخنەگرو هەڵسەنگێنەر لەدنیای ئەدەبەکەماندا.

لەم‌ڕووەوە ئەگەر لە سەر شیعری ( نەوباوەی خەیاڵ ـ دیوان ۴۴۱) هەڵوەستەیەک بکەین ئەوەڕاستەوخۆ بەوئەنجامە ئەگەین .

ئەم شیعرە لە ناوەڕۆکدا بریتیە لە هەڵسەنگاندنێکی ئەدەبی لە نێوان‌دووشیعری دوو شاعیری‌تردا ( خانای قوبادی ) و ( مەحروم ) .

خانا ئەڵێ :

بەرقی سەیفی ناز ئەبرۆ خەمینان
عەکسی ماوی خاڵ ، خورشید جەمینان

ئەربگنۆ وەکۆی قولەی قەزاڵە
مەکەرۆش وەبووڵ سفتەی سەد ساڵە

واتە : تیشکی شمشێری نازی ئەبرۆ کەوانیەکان و وێنەی خاڵی شینی ئەوانەی کە ڕوخساریان لە خۆر ئەچێ ، ئەگەر بکەوێتە سەرکێوی قەزاڵە ، ئەوە ئەیسوتێنێ و وەکو خۆڵەمێشی سەدساڵ لەمەو بەری لێ ئەکەن .

مەحروم کە شاعیرێکی هاوچەرخی مەولەوی بووە لە بەرامبەر ئەم شیعرەی خانادا چوار بەیتی داناوەو داویەتە دەستی مەولەوی کە بەراوردیان بکات و هەڵسەنگاندنیان لە سەر بکات .

ئەڵێ :

بەرقی بەرقەی ناز عیشوە فرۆشان
چەخماخەی لەنجەی تەلاّ نەگۆشان

بزیسکەی نیگای دیدە شابازان
بریقەی غەمزەی شەکەرین ڕازان

ئەربگنۆ وەسەنگ جای تەجەللای نوور
مەکەرۆش وەگەرد چون سورمەی کۆی توور

( مەعدوم ) ڕاس ( خانا ) سوزانی عەشق بێ
کەی وێنەی ( مەحرووم ) هەر عەشقش مەشق بێ ؟

واتە : تیشکی چارشێوی نازی نازفرۆشەکان و بروسکەی لەنجەولاری ئاڵتون لە گوێکان و بزیسکەی نیگای ئەوانەی چاویانلە چاوی شاباز ئەچێ و پرشنگی خەمزەی ئەوانەی قسەیان شیرینە . ئەگەر بکەوێتە سەر ئەو بەردەی کە نووری تیا هەڵکرا وەکو سورمەی کێوی توور ئەیکاتە گەرد و تۆز . مەعدوم ڕاستە کە خانا سووتاوی عەشق بووە ، بەڵامکەی وەکو مەحروم هەمیشە مەشقی عەشق بووە ؟.

لە دوا بەیتی ئەم شیعرەدا بە ئاشکرا دەنگی مەحرووم دیارە کەداوا لە مەولەوی ئەکات شیعرەکەی لەگەڵ شیعرەکەی خانادا هەڵبسەنگێنێ . مەولەویش بەم شێوەقسەیان لە سەر ئەکات .

نەوباوەی خەیاڵ ( مەحرووم )ی دانا
ڕەدیفی لەتیف زەریفی ( خانا )

یاوا وەدیدەی کەم بینام ساوا
جە نەوبینایی پەی دیدەم یاوا

پەیرەویی ( خانا )ت یاد ئاوەردەبی
ئەو ئەسڵ و وێت فەرع حەساو کەردەبی

لاکین زادەی تەبع بۆ عەنبەرینت
دەس ڕێسەکەی فیکر بیکر شیرینت

پەسەندیدەی فام عەقڵ دانابی
خاستەر جەخەیاڵ خاسەی ( خانا )بی

زیادە پەی فەرع وەسەر ئەسڵەدا
خاسەی واتەی تۆن جەی سەرفەسڵەدا.

**واتە** : ئەو شیعرانەی کە بەرهەمی نوێی خەیاڵی مەحروومی زانان کە هاوچەشنێکی ناسک و جوانی خانای قوبادی‌یە ، پێم گەشتن و سویمن بە چاوەکزەکانمدا . چاوە کزەکانم سەر لە نوێ ڕۆشنایی‌یان تێ کەوتەوە. وات هێنابووە خەیاڵی خۆتەوە کەشوێن خانای قوبادیی کەوتوویی ، ئەوت داناوە بەتەنەی درەخت وخۆت کردووە بەلقی ، بەڵام ئەو شیعرانەی کە لە زەوقی بۆن خۆشی تۆ کەوتبوونەوەو بە دەستی بیری بە خەیاڵی کەسدانە هاتووی تۆ ڕێسرابوون ، لای عەقڵی ئینسانی زانا پەسەند و دڵگیر بوون و لە خەیاڵە تایبەتیەکەی خانا جوانترو دەلال‌تر بوون . سەرکەوتنی لقی درەخت بە سەر تەنەدا لەم چەرخەدا بە تەنیا بۆ تۆ هەڵکەوتوەو بۆ کەسی تر نەلواوە .

**********

ئەمەوێ لە دوای لێکدانەوەی ئەم شیعرانە بڵێم : مەولەوی هۆشیارانە هەڵسەنگاندنێکی ئەدەبی‌ی لە سەر هەردوو شیعرەکە کردووە .کەواتە شیعرەکەی مەولەوی بابەتێکی ڕەخنەیی‌یە .

لەم ڕووەوە ئەتوانین بڵێین کە ئەگەر لە سەردەمی ژیانی مەولەویدا ئەدەبی کوردی وەکو ئێستە بازاڕی گەرم بوایە ، ئەوا مەولەوی ئەو شیعرەی نەئەنووسی و لە باتی ئەوە سەرنج و تێبینیەکانی خۆی لە سەر هەردوو شیعرەکە بە شێوەی وتارێکی ڕەخنەیی ئەنووسی . بەڵام چونکە لەوسەردەمەدا ئەدەب بریتی بووە لە شیعرو هیچی‌تر مەولەویش ناچار بووە سەرنجەکانی بدات‌لە قاڵبی شیعر .

دیارە ئەگەر لە سەردەمی خەیامیشدا ئەدەبی فارسی هەر شیعر نەبوایە و وتار نوسینیش باوی هەبوایە ، ئەوا خەیامیش بیروڕاکانی بە پەخشان ئەنوسی ، وەکو هەر کتێبێکی‌تری فەلسەفی کە ئەیبینین . بەڵام‌خەیام ناچار بووە لەگەڵ ئەو هەموو

فیکر کردنەوەدا زەحمەتی شیعر نوسینیش بداتە بەرخۆی ، چونکە شیعر تاقانە بڵندگۆی ڕاگەیاندن بووە .

وەهەروەها ئەگەر هەر شیعر نەبوایە ئەوا پێم وایەنیظامی‌یش خەمسەکەی بە پێنج ڕۆمان ئەنوسی .

شیعرەکەی مەولەوی ئەگەربکرێت بەپەخشان ئەواکورتەوتاریک دەرئەچێت . کەواتەشیعرەکە چەند لە سەرشیعرماڵە ئەوەندەش ڕەخنەی تیدایەو ئەچێتە خانەی ڕەخنەوە .

بەم پێ‌یە هەقی خۆمانە کە لە سەیر کردنەوەو چاوگێڕانەوە بەئەدەبەکەماندا لەسەر ئەم شیعرە ڕاوەستین و بڵێین مەولەوی یەکەمین هەنگاوی ڕەخنەی لە ئەدەبی کوردیدا ناوە .

وەئەبێ ئەوەش لە بیرنەکەین کەهاوزەمانلەگەڵ مەولەوی‌دا ( نالی )یش سەرەتایەکی لە ڕەخنە خستوینەتە بەردەست . لە شیعرێکی حاجی قادری کۆیی‌دا وا دەرئەکەوێ کە حاجی چەند شیعرێکی‌داوەتە لای نالی تا سەرنج و تێبینی خۆی لە سەریان دیاری بکات . نالیش شەن وکەوێکی شیعرەکانی کردووە و وای‌داوەتە قەڵەم کە کاڵایەکن وکڕیاریان نیە .

(ئیتیفاقەن ئیتیفاقم بوو لەگەڵ نالی وەکو
تاجرو گەوهەر لەگەڵ گەوهەر فرۆش و موشتەری

چەند غەزەل بوون تازە بافتی کارگاهی موشتەری
تاجرو گەوهەر مەتاع و شامی غوربەت تاجری

یەک یەکی هێنایە دەر گەردی کەسادیی لێ تەکاند
دایە من فەرمووی درێغا کەس نیە سەوداگەری

دەست بەدەستی خستم و هەم دایە بەربا مەجمەعم
( ئاصەف )ی من بای لەباتی تۆ کە حاجی قادری ؛

بەڵام چونکەنالی خۆی نەینوسیوە ئەوە نابێتە بەڵگە کە قسەی لە سەر بکەین . بەس دڵنیام ئەگەر لەوسەردەمەدا ئەدەب وەکئێستە بوایە ئەوا نالی‌یش وتارێکی ڕەخنەیی لە سەر ئەو چەپکە شیعرە ئەنووسی .

کەواتە هەر ئەتوانین شیعرەکەی مەولەوی بکەینە دامەزرێنەر و قسەی لەسەر بکەین .

### ئەو هەوڵانەی کە بۆخزمەتی بەرهەمەکانی مەولەوی دراوە .

مەولەوی شیعرەکانی ئەوەندە بەرز و هونەرین و ئەوەندە پڕ زەوقن ، لە سەردەمی ژیانی خۆیدا وتا ئەودەمەش کە چاپ هاتۆتەکایە ، شاعیران و شیعر دۆستان لەڕووی بەیاز ونوسخەکانی خۆیاندا بەشانازی یەوە نوسیویانەتەوە . کە ئەوانە ئەمڕۆ لە بەر دەستماندا سەرچاوەیەکی باشن بۆ ساخ کردنەوەی شیعرەکانی و تەواوداڕشتنی بەرهەمەکانی ، هەرکە کوردیش دەستی بە چاپخانە گەشتوە ، مەولەوی لە ڕیزی پێشەوەی ئەوشاعیرانەیە کە بەرهەمی چاپ کراوە. ئێستەش ئەو هەوڵ و تەقەللا دیارانەدەست نیشان ئەکەین کە لەم مەیدانەدا دراوە.

١ ـ چاپکردنی ( عەقیدە مەرضیە ) و ( فوائح )ەکەی لە یەککتێبدا بە تێکۆشانی ( فرج اللەزەکی ) و (محی الدین صبری نعیمی کانیمشکانی ) لە ساڵی ١٣٥٢ هـ ، ١٩٣٤ ز دا . لەوڵاتی میسر و کەسی دووەم بۆتە بڵاوکەرەوەی .

٢ ـ ڕۆحی مەولەوی لەدوو بەرگ دا. کە وەرگێڕانی شیعرەکانی مەولوی یە لە هەورامی یەوە بۆ شێوەی سلێمانی. بەرگی یەکەم ١٩٣٥ . بەرگی دووەم ١٩٤٠ . لەلایەن پیرەمێردەوە .

٣ ـ مەولەوی و شیعری موناسەبەت : وتارێکی بەنرخ و پڕبایەخی مامۆستا گۆرانەکە لە ژمارەکانی ( ٨ ـ ٩ ـ ١٠ )ی گۆڤاری ( هەولێر )دا بڵاوی کردوتەوە . ساڵی ١٩٥٠ ز.

٤ ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ، شاکاری خوالێخۆشبو علاءالدین سەجادی کەلە چەند پەڕەیەکدا باسێکی شایانی لە سەر مەولەوی کردووە . ساڵی ١٩٥٢ ز .

٥ ـ دیوانی مەولەوی : ئامادەکردنی بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لەساڵی ١٩٦١ دا کە ئەمە گەورەترین دەروازە بوو لە ڕووی گیانی مەولەویدا کرایەوە.

٦ ـ ئەدەبی کوردی ولێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی خوالێخۆشبو علاءالدین

سەجادی . ساڵی ١٩٦٨ ز . لەم بەرهەمەشدا لێکۆڵینەوەیەکی باش لە سەرمەولەوی کراوە .

٧ ـ الفضیلة : بەرهەمێکی مەولەوی‌یە بە زمانی عـەرەبی . بـەڕێزماموٚستا مـەلا عەبدولکەریم بە زمانی عەرەبی لێکۆڵینەوەیەکی شایانی لە سەر ئەم شاکارە کردووە و ساڵی ١٩٧٧ چاپ بوە.

٨ ـ عەقیدەمەرزیە : بەرهەمێکی‌تری مەولەوی‌یە بە شێوەی ئاخافتنی جـاف لە لایەن ماموٚستا مـەلا عـەبدولکەریم و خـوالێـخۆشبو مـەلا فـاتیحی کـوڕیەوە شـی کراوەتەوە.

٩ ـ مەولەوی و سروشت : نوسینی بەڕێز عەلی شێخ عومەرقەرەداخی .

١٠ ـ لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی : تیزی دکتۆرای کاک ئەنوەر قادر محەممەدە وساڵی ١٩٩١ لە ستۆکهۆڵم چاپ بووە .

١١ ـ دیوانی مەولەوی ، بەرگی یەکەم : وەرگێڕانی شیعرەکانی مەولەوی بۆ سۆرانی لە لایەن بەڕێز ماموٚستا محەممەد ئەمین ئەردەڵانی‌یەوە . ١٩٩١ ز

١٢ ـ میهرەجانی مەولەوی : کۆمەڵێک وتاری میهرەجانەکەیەو بە شێوەی کتێبێ چاپ بوە .

١٣ - ریسالەی عیشق : لێکۆڵینەوەیەکە لەلایەن خوالێخۆشبوو دکتور سدیق مـوفتی زادەوە کراوە لەسەر نیوەی دیوانی مەولەوی.

١٤ ـ مولوی فی وثائق‌قدیمة : وتارێکە بەزمانی عەرەبی لەلایەن‌کاک ڕەئـوف عوسمانەوە کە گۆشەیەکی پرشنگداری ژیانی مەولەوی ئەخاتە ڕوو . کاروان ژمان ١٣ ـ ١٩٨٣ .

١٥ ـ یادی مەردان : دانراوی بەڕێز ماموٚستا مەلا عەبدولکەریمی مـودەریس . بەرگی دووەم . لەم کتێبەدا یادێکی باش لە مەولەوی کراوەتەوەو چەپکێ نامەیشی

چاپ کراوه کەبە فارسی بۆ دۆست و هاوڕێکانی نوسیوه.

۱۶ ـ دوو وتاری خوالێخۆشبو مامۆستا سەید تاهیری هاشمی کە لە دووژمارەی گۆثاری ( سروه )دا بڵاو کراونەتەوه. بە داخەوە ژمارەکانم نەزانی بەڵام ئـەزانـم دوو وتاری بەکەڵکن.

۱۷ ـ کۆنگرەی مەولەوی : لە ساڵی ۱۳۷۱ ، ۱۹۹۲ دا کۆنگرەیەک لە سێ ڕۆژدا لەسەر ژیان و شیعری مەولەوی بەستراو پاشانیش لە ساڵی ۱۹۹۵ دا بە شێوەی کتێب چاپ بوو.

## ـ ئەو سەرچاوانەی کە سوودیان لێ وەرگیراوە ـ

١ ـ نوسخەی ( شەهاب ) واتە سەیید شەهابی سەنەندەجی : ئەم نوسخەنایابە بە خەتێکی جوان نوسراوەتەوە ، نوسەرەکەی زۆر بەزەوق بووەو جگە لە مەولەوی هەندێ شیعری لە شاعیرانی تریشی نوسیوەتەوە وەکو (بێسارانی ، کۆماسی ، کوردی ، نالی و چەند شاعیرێکی فارس ). کەلەبەشەکەی مەولەویدا زۆر وەستایانە دەستی پێکردووەو پێشەکی پێرستێکی شیعرەکانی کردووە وژمارەیەکی زۆرلە شیعرەکانی نوسیوەتەوە .

شایانی باسە لەگۆشەیەکی ناوەڕاستی نوسخەکەشدا مێژوویەکی لێ داوە (١٢٧٩) ئەمەش ئەوەمانبۆ دیاری ئەکات کە کاتێ ئەم نوسخە نوسراوەتەوە مەولەوی لەژیاندا بووەو ( ٢١ ) ساڵ دوای ئەوە کۆچی دوایی کردوە .

٢ ـ نوسخەی ( سیروس ) : ئەم نوسخەیە گەلێ شیعری مەولەوی تیایە لەگەڵ شیعری چەند شاعیرێکی تردا . کاک سیروس مەعروفی دایە لام و سوودملێ وەرگرت ، نوسەری ئەم نوسخە ناوی دیار نیە ، بەڵام کە تەواوی کردووە لەسەری نوسیوە(غزلیات کردی حضرتسید رحیممولوی علیەالرحمە تا اینجابدست آمد تحریر گردید حسبالفرمایش حضرت صاحب کارآغای اعزازالملک ادام اللەاقبالە وطول عمرەبجاە محمد والەفی ٤ محرم ١٣٤٠).

واتە : غەزەلیاتی کوردی هێژا سەیید ڕەحیمی مەولەوی ڕەحمەتی خوای لێبێ تا ئێستە کە بەدەست هاتوە نوسرایەوە بە پێی فەرمانی هێژای خاوەنکار ئاغای ئیعزاز ولمولک خوا درێژە بدا بە بەختی و تەمەن درێژی بکات بۆ خاتری محەممەد وبنەماڵەکەی ... )

٣ ـ نوسخەی ( شەوکەت یاریان ) ئەمنوسخەش بە خەتێک کەباش ئەخوێنرێتەوە نوسراوەتەوە . لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەشیعرەکانی مەولەویدا هەندێ شیعری

(کۆماسی ، فانی ، شێخ ڕەضا ، طاهیربەگی جاف ، فخرالعلما ، وەفایی ، میرزا عەبدوالقادری پاوەیی لە گەڵ چەند شیعرێکی فارسیدا ) نوسیوەتەوە .

ئەم نوسخە مێژووی ۱۳۳۷ ی پێوەیەو بەدەستی حاجی میرزا ئەحمەدی شەوکەت یاریان نوسراوەتەوە. کە ئەم زاتە لەساڵی ۱۲۸۴ لەدایکبوەو لە ۲۹ی مرداد ۱۳۶۶ دا لەشاری سنە کۆچی دوایی کردووە .

شایانی باسە خوالێخۆشبو میرزا ئەحمەد خۆیشی هەندێ شیعر ویاداشتەکانی ڕۆژانی ژیانی بە یادگار بۆ بەجێ هێشتووین .

۴ ـ نوسخەی ( میراث) ئەم نوسخەیە لەئارشیفی ئیدارەی میراث فەرهەنگدا بوو ، برای بەڕێزکاک سیروسی مەعروفی بۆماوەیەک دایە لام و سوودم لێ وەرگرت .

نوسخەکە بە داخەوە لەمسەرو لەو سەریەوە لێی لاچوو بوو ، نەمێژووی پێوەدیار بوو نە ناوی نوسەرەکەی . بەڵام نوسخەیەکی چاک بوو بەشی زۆری تایبەت درابوو بە مەولەوی .

۵ ـ نوسخەی (مەحزون ) واتەمیرزا سدیقی مەحزوون . ئەم نوسخەیە گەلێ شیعری فارسی لە ( حافظ ، سعدی ، خیام .. هتد ) تێدایەلەگەڵ ژمارەیەکی زۆرشیعری کوردی (کوردی ،نالی ، وەفایی ، کۆماسی ،شەهاب ) و زۆربەی شیعرەکانی مەولەوی .

نوسخەکەلە ڕۆژی دووشەممە ۲۷ی ذی‌الحجەی ساڵی ۱۳۲۷ دەست کراوە بەنوسینەوەی و جەنابی میرزا سدیق ئەلێ :یادگاری باوکمە. « بە ڕەحمەت بێ ».

نوسخەیەکی چاکەوپاک هەڵگیراوە ولەنوسخەکانی تری لای ئێمەزیاتر شیعری بڵاو نەکراوەی مەولەوی تیا بوو.

۶ ـ نوسخەی ( باینچو )واتە سەییدەکانی باینچو کەبەداخەوە ناوی نوسەرەکەی دیار نیە. من ئەم نوسخەیەم لە ڕێگەی برای شاعیرم کاک ڕەحیمی لوقمانیەوە دەست کەوت (بە شێوەی فتوکوبی) . بەڕاستی نوسخەیەکی گەلێ دەوڵەمەندەو لە ( ۲۲۵ )

لاپەڕەدا بە خەتێکی جوان نوسراوەتەوە . بێجگە لە بەشی هەرەزۆری کە تەرخان کراوە بۆ مەولەوی ، لە بەشێکی تریدا شیعری ( بێسارانی ، وەلی دێوانە ، سـادق ، کـۆهزاد بەگی خوڕخورە . میرزا شەفیع ، ناری ، سیف‌الشافعی ، حاجی محەممەدی تیلەکۆ)ی تێدایە .

لەوە ئەچێ یادگاری ( امین السادات ) بێ .

٧ ـ نوسخەی ( میم ) ئەم نوسخەیە نە مێژووی دیارە و نە ناوی نوسەر ، من لەڕێگەی بەڕێز میرزا محەممەدی سابری‌یەوە وەرم گرت . بەشێکی زۆر شیعری مەولەوی تێدا نوسراوەتەوە خەتەکەشی جوانە . بەڵام بەداخەوە سەرەتاو کۆتایی نەماوە .

٨ ـ نوسخەی ( خەسرەو ڕوانسەری ) ئەم نوسخەیەش بە داخەوە ناوی نـوسەرو مێژوی دیار نیە ، بەڵام نوسخەیەکی عەنتیکەیەو زۆربەی هەرەزۆری شـیعرەکـانی مەولەوی بە خۆوە گرتوە . بەخەتێکی جوان نوسراوەتەوەو باش هەڵگیراوە.

٩ ـ نوسخەی کاک شێخ محەممەدی نەقشبەندی : کە نوسخەیەکی بـە داخـەوە پەڕپوت بوو ، تەنیا چوارینەیەکی مەولەوی تێدا بوو کە ئەویش بڵاو نەکرابویەوە ، هەروەکو لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی پێ ئەکەین.

١٠ ـ نوسخەی ( دۆڵاوی ) واتە مەلا مستەفای دۆڵاوی . ئـەم نـوسخەیەش بـە خەتێکی باش نوسراوەتەوە . لەگەڵ بەشێکی زور لە شیعرەکانی مەولەویدا . هەندێ شیعری خۆیشی لەگەڵ چەند پارچەیەکی ( مەلاعەبدولخالقی کۆڵەساری ـ حەزین)دا بڵاوکردوتەوە . بە پێی مێژوویەک کە بە سەریەوەیەتی ( ٦٥ ) ساڵ بەر لە ئێستە دەس کراوە بە نوسینەوەی و هەمویشی بە خەتی ( مەحزون )ە.

١١ ـ نوسخەی ( زیائەدینی ) « ض ». واتە نوسخەی بنەماڵەی هەردوو هونەرمەند کاک هادی و کاک مەهدی ( زیائەدینی )ی . ئەم نوسخە دەوڵەمەندە من تەنیا بۆ بەراورد و پشکنین سوودم لێ وەرگـرتوە ، چـونکە بـەر لە مـن کـەوتبوە دەست بـەڕێزکاک محەممەدی حەمەباقی و ئەزانم ئەوان سود لە شیعرەبڵاونەکراوەکانی وەرئەگرن .

شایانی باسه که جارێکی ترکتێبخانەی ئەم بنەماڵەیەم دیەوە شیعری (شەوق شادی نۆ )م لەدەست کەوت کە بە جیا نوسرابویەوە ولەنوسخەکەش دا نیە.

١٢ـ نوسخەی جەنابی عبدالغفاری وارستگان ( وا ) ئەم نوسخەیەش مێژووی پێوەدیار نیەوناوی نوسەریشی لە سەر نەنوسراوە ، ئاغای وارستگان کاتی خۆی لەهەورامان دەستی کەوتوەو چەندین ساڵە لای خۆی پاراستویە. کۆمەڵێ شیعری مەولەوی تیایە لەگەڵ تاک وتەراشیعری (صەرعی ، هیجرانی ،بزورگ ، خەستە ،فانی ، مەجذوب ، مەحروم ،عبدالله ، عولاٚم ، شەهاب ، حەیدەر ، غەمناکی ) .

١٣ ـ نوسخەی مەلا حەیدەری ئاویهەنگی . ئەم نوسخەش نوسەرو مێژووی دیار نیە ، خەتەکەشی زۆر جوان‌نیە ، هەندێ شیعری مەولەوی تێدا بڵاوکراوەتەوە لەگەڵ چەند شیعرێکی ( بێسارانی ، کۆماسی ، شەهاب ). ڕەنگی کۆنیی پێوەدیارەو ڕۆژگاردەستی خۆی لێ وەشاندوە. ئەم نوسخەیەم لەڕێگەی کاک مەلائەحمەدی نەزیریەوە دەست کەوت سوپاسی ئەکەم .

١۴ – نوسخەی مەلا عەلی : ئەم نوسخە کراوە بەدوو بەشەوە ، بەشی یەکەمی شیعری کوردی‌یە کەزۆربەی شیعرەکانی مەولەوی تێدا نوسراوەتەوەلەگەڵ چەند شیعرێکی بێسارانیدا .

بەشی دووەمی شیعری جۆراوجۆری شاعیرە فارسەکانە وەکو ( جامی ، ظهیر ، ابوعلی سینا ،خاقانی ، نظامی .. هتد ) لەگەڵ چەند شیعرێکی فارسی مەولانا خالید و مەستوورەوکوردی .

ئەم نوسخەیە بە خەتێکی جوان نوسراوەتەوەومێژووی (١٣٢٥ و ١٣٢٨ و١٣٣٢ ، ١٣٣٥ ) پێوەیەو لە هەندێ لە لاپەڕەکانیدا چوار جۆر مۆری لێ داوە ، ( علی ابن عبدالرحمن ) ، (امین الشریعة ) ، ( یا علی ادرکنی ) ، ( یا علی ) .

بێجگە لەدووبەش کردنی نوسخەکە ، لە هەندێ لاپەڕەی تریدا شیعری دوو

شاعیری تری کوردی بڵاوکردۆتەوە وەکو (میرزا شەفیعی کولیایی ومحەممەد ناوێک).

(کاتب این کتاب ملا علی خلف مرحوم ملا عبدالرحمن پسر ملا محمد ابن ملارشید ابن ملانصیر ابن ملا غفور ابن مولانا حسین ابن مولانا یوسف علیه الرحمة، و مقبره مرحوم مولانا یوسف در مزرعه دویشان در قریه مامق علیا زیارتگاه اهالی آن حوالی میباشد و مرحوم مولانا یوسف عالمی بی نظیر و ولی کامل صاحب خوارق و شخصی فاضل بوده وازاو پشت بر پشت ایشان بحضرت ابوبکر صدیق رضی الله تعالی عنه میرسد والله اعلم بحقایق الامور).

واتە: نوسەری ئەمکتێبە مەلا عەلی کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلامحەممەدی کوڕی مەلا ڕەشیدی کوڕی مەلا نەسیری کوڕی مەلا غەفوری کوڕی مەولانا حسەینی کوڕی مەولانا یوسفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ گۆڕی خوالێخۆشبو مەولانا یوسف لە کێڵگەی (دویشانە = دووشان) لە گوندی ماموغی سەروو کە زیارەتگای خەڵکی ئەو ناوەیە. وەخوالێخۆشبو مەولانا یوسف زانایەکی بێ وێنەو وەلی یەکی تەواوی خاوەن خەواریق و کەسێکی هێژا بووە ،لەوەوە پشت بە پشت ئەچێتەوە سەر حەزرەتی ئەبوبەکری سدیق (ر-خ)،ڕاستی ی کارەکان خوائەیزانێ.

شایانی باسە ئەممەولانا یوسفە شاعیریش بووەونووسەر شیعرێکی لێ بڵاوکردۆتەوە کە شیعرێکی فارسی (٤٣) بەیتی یە.

١٥ - کتێبی میهرەجانی مەولەوی.

١٦ - گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی (٦).

١٧ - کەشکۆڵی کەلەپوری ئەدەبی کوردی - ئامادەکردنی موحەممەد عەلی قەرەداغی.

## - پشکنین -

دیوانی مەولەوی بۆ یەکەمجار لە لایەن بەرێز و خۆشەویست مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریسەوە چاپ و بڵاو کرایەوە و چـاوی خـوێنەرانـی پـێ ڕۆشن بوویەوە . ئەمە هەنگاوێکی گەورە بوو بۆ ژیانەوەی گـیانی مـەولەوی . چونکە جگە لەوەی کە شیعرەکانی خستۆتە ڕوو ، شەرحیشی لێ کردووە . کە ئەگەروانەبوایە هێندە نەئەناسرا ، چونکە شیعرەکان هەورامین و خەڵکی نـاوچە جۆراوجۆرەکانی کوردەواری بەئاسانی تێ‌ی‌نەئەگەشتن .

من بۆ خۆم وەک عاشقێکی شیعری مەولەوی دەست خۆشانە بە جەنابی مامۆستای هێژا ئەڵێم و لەگەڵ ئەوەش‌دا داوای لێبوردنی لێ ئەکەم کە دیوانەکە هەندێ هەڵەو کەم وکوڕی و ناتەواوی تێدایە ، منیش بە پێ‌ی ئەو نوسخانەی کە لە شاری سنەو دەوروبەریدا دەستم کەوتوون هەوڵی پیاچونەوەی دیوانەکەم داوە ، هیوادارم ئەمەش هەنگاوێکی‌تر بێ بـۆ بـاشترئاشنا بـوون بـە گـیانی بـەرزەفڕی مەولەوی . وا بە پێ‌ی تەرتیبی دیوانەکە دەست بە کارەکەم‌ئەکەم .

١ ـ شیعری (١) پیتی (ئەلف).

لە دوای بەیتی ( شیعر وێم تەنخوای ... ) بە پێ‌ی نوسخەی ( باینچو ) ئەم بەیتە هەیە :

سانەیچی دەخیل بێ دێر و درەنگ

موتریب فیدات بام دەس بدەر ئەو چەنگ

وە لەدوای بەیتی ( سا دەروێش کەفێ .. ) ئەم سێ بەیتە هەیە :

کەف بدەر ئەو دەف ، پەنجەت نەرووی نەی

بە وێنەی باربود جە بەزم ئارای کەی

نکیسا ئاسا دەس دەر وەسەمتوور
دەف ونەی و چەنگ باوەر وەحوزور

چلچەنگ و سەرچەنگ لێدەر دەرقەرار
وەهەزار دەستان بنوازم ئەمجار

وە لەدوای بەیتی ( ساقی سادەخیل ... ) ئەم چەند بەیتە هەیە :

وێت بە حەقیقەت مەست بکەر جەمەی
سازان بسازە پەی واوەیلاو وەی

کەف بدەر وەدەف ، چنگ بدەر وەنەی
هیچ مەواچە کەی تو خوودا سادەی

بەو ئاوازی بەرز خاس بکەر ڕازان
بە عەشقی ئازیز نازک ئەندازان

جۆش دەر وەناڵەم ، کوڵ دەر وەدەردم
هۆش دەر وە خەمان ، گۆش دەر وەفەردم

ئازیز بێ خەبەر ، مەینەت با خەبەر
چەنی ڕۆ مەبۆ اللهاکبر

وەلە باری واژەوە بە پێی نوسخەکەی ( شەهاب ) لە بەیتی :

بەڵکە خەمانم تۆ دەری وەباد
هەی های جوانم ، فرێم هەن موراد

لە باتی ( هەی های ) نوسراوە ( هێمای ) کەئەمەیان دروستە ، واتە هێشتا لاوم.

وە لەبەیتی :

وەختەن سەرتاپام ببۆ وەزوخاڵ
بۆی سفتەکەم هۆر گێرۆ شەماڵ

لەباتی ( بۆی سفتەکەم ) نوسراوە ( بولی سفتەکەم ) کە ئەمەیان دروستە . واتە خۆڵەمێشی لاشە سوتاوەکەم .

۲ ـ شیعری ( ۲ ) پیتی ( ئەلف )

واژەی ( دەوڵەتەکەی ) لە سەرەتای بەیتی دوودا هەجایەکی زیادەو دروستەکەی ئەوەیە بگوترێ ( دەوڵەتکەی ) واتە : دەوڵەتە بچکۆلەکەی ..

وە لە دوای بەیتی ( سادڵم وەش کەر .... ) بە پێی نوسخەکەی (مەحزون) ئەم بەیتە هەیە :

با بەیۆ وەش وەش سۆزی سەداکەت
لەرەی نەوای تەرز شیرین ئەداکەت

وە بەیتی :

کێ زانۆ چون بۆ ئەی دنیای فانی
بابۆ نە بەین گەردن ئازادی

( فانی ) و ( ئازادی ) نابنە قافیە . بە پێی نوسخەکانی ( شەهاب ) ، ( مەحزون ) ، ( ض ) ،

( دۆلاوی ) ، (سیروس ) ، له باتی ( فانی ) نوسراوه ( بادی ) واته : بایهەوا .که ئەمه دروسته .

۳ ـ شیعری ( ۴ ) پیتی ( ئەلف )

مامۆستا نوسیویه : مەولەوی ئەم غەزەلەی لەوەڵامی دۆستێکیا نووسیوه که نامەی بۆ ناردوه و گلەیی لێ کردووه له نامەکەیدا.

سەرچاوەکانی لای ئێمەیش ناوی ئەو دۆستەیان دیاری نەکردووه ، بەڵام هەرکەسێ بێ بەیتی شەشەمی ئەم شیعره هی ئەوه و مەولەوی تێهەڵکێشی نامه شیعریەکەی خۆی کردووه.

نه وەخت هیجران ویداعت فاما
نه وه شەماڵدا پەیامت ئاما

چاکتر وابووئاماژەی پێ بکرایه . چونکه مەولەوی خۆی له پێشەوه ئەڵێ :

( فەرمابیت بەو لەفز شەکەر ڕازەوه ).

وه بەیتی :

زوان چون تاقەت هیممەت وازیشەن
دیده چون تاقەت شون دیاییشەن

له نوسخەی (دۆلاوی )دا له باتی ( وازیشەن ) نوسراوه ( خوایيشەن ) که ئەمەیان دروسته و له نوسخەی ( شەهاب ) و ( باینچو )شدا له باتی( تاقەت )ی میسرەعی دووەم نوسراوه ( تامڵ ) که هەر ئەم دروسته ، چونکه دووبارەکردنەوەی تاقەت له دوو میسراعدا مەولەویانه نیه.

۴ ـ شیعری ( ٥ ) پیتی ( ئەلف ) :

ئەمشیعره بۆ کۆماسی نوسراوه و بەیتەکانی ( ۱۴ ، ۱٥ ، ۱٦ ) هی کۆماسین و له شیعری

(پەی چێش نەشۆجێش) وەرگیراون و تێهەڵکێش کراون.

بەندە دوای کۆکردنەوەی دیوانی کۆماسی ئەمەم بۆ دەرکەوت وشیعری دوای ئەمەی دیوانەکە (ئەنیس خەیاڵ دەردان پڕ زام)شیعری کۆ ماسی‌یە و لەوەڵامی شیعرەکەی مەولەویدا نوسراوە. بۆ بەراووردیش ئەتوانین وەهای دیاری بکەین.

| مەولەوی | کۆماسی |
|---|---|
| گلەم هەن جە تۆ خەیلێ فراوان (میسرەعی ١٨) | نەکەری خەیاڵ گلەیی کەردەن ( میسرەعی ٢٧ ) |
| مەربادەت نەجام بێ شەرتی وەردەن(میسرەعی ٢٠) | نەواچی بادەی بێ شەرتیش وەردەن(میسرەعی٢٨) |
| یانی چێش مەیلت فەرامۆش کەردەن (میسرەعی١٩) | کەی مەبۆ مەیلت فەرامۆش کەروون (دوامیسرەع ) |

وەلە شیعرەکەی کۆماسیدا بەیتی چوارەم لەباتی (گەردوون ئازادی) بنوسرێ (گەردەن ئازادی) ڕاست و دروستە.

ئەمە یەکێکە لەو شیعرانەی کە بە هەڵە پەڕیوەتە دیوانی مەولەوی‌یەوە.

٥ـ شیعری (١١) پیتی (ئەلف). بەیتی یەکەم :

ئازیزم، ئامای، ئای بێ قەرار وێم
ئای ئای چەمەڕا، ئای ئینتیزار وێم

لە نوسخەی (وا)دا لەباتی (ئامای) نوسراوە (نامای) ئەمە دروستە. واتە نەهاتی.

٦ـ شیعری (١٢) پیتی (ئەلف)

لە نوسخەی (دۆڵاوی)دا بەمبەیتە کۆتایی دێ.

دڵ وەتەنگ ئامان هانا هامفەردان
بەیان وەسەر مەشق گردین هامدەردان.

٧ـ شیعری (١٥) پیتی (ئەلف) :

بە پێی نوسخەی (شەهاب) لە نێوان دوا بەیت و بەر لەودا ئەم بەیتە هەیە .

نەقدی گیان شاباش باڵای ئاڵاش کەر
موژە بۆ جاروب گەردی پاڵاش کەر

٨ـ شیعری (١٧) پیتی (ئەلف).

بەیتی شەش : سروور نەشئەی بادەی وەسڵ تۆن .
تەئسیر بۆی عەتر موشک زوڵف تۆن

بە پێی نوسخەی. (خەسرەو) لەباتی (وەسڵ) نوسراوە (لوتف) کە ئەمە دروستە .
چونکە لە بەیتەکەدا هەردوو (تۆن) ڕەدیفن ،کەواتە (وەسڵ) و (زوڵف) نابنە قافیە .

٩ـ شیعری (١٨) پیتی (ئەلف)

بەیتی سێیەم: سا ، دەروێش : وەعیشق مەولای دەروێشان
وەیاهوی وەسۆز ڕیازەت کێشان

لەم بەیتەدا (مەولای دەروێشان) ئاماژەیە بۆ مەولانا خالیدی نەقشبەندی .

١٠ـ شیعری (١٩) پیتی (ئەلف).

بەیتی سێیەم : بینایی وەڕاست دڵەی پڕ دەردم
ئای چەند سەرسەخت بیم لوای نەمەردم

لەنوسخەکانی (شەهاب) ، (مەحزون) ، (دۆڵاوی)دا لەباتی (دڵەی) نوسراوە (دیدەی)
کەئەمە ڕاستەو واتە بینایی ڕاستەقینەی چاوی پڕ دەردم . بینایی پەیوەندی بە چاوەوە

هەیە نەک دڵ .

وە لەدوابەیت دا

سا ئیسە ، ها دەرد دەروێش ئاوەرد جۆش

سەبرت ئەر ئازان بمانۆشنۆش

لە نوسخەی (شەهاب ) و (دۆڵاوی)دا لەباتی (شنۆش) نوسراوە ( وەهۆش ) کە ئەمە دروستە. واتە ئەگەر ئارامت ئازایە بە هۆشەوە بمێنێ.پەیوەندی نێوان هۆش وسەبرنزیکترو گونجاوترە تا ئەو .

١١ ـ شیعری ( ٢٣ ) پیتی ( ئەلف )

دوا بەیت :   جامێمان جەدەس تۆ هەم سەندەبۆ

فرسەتەن ، نسیو نەک نەماندەبۆ

لە نوسخەی (دۆڵاوی )دا لە باتی ( نەماندە ) نوسراوە ( نەمەندە ) هەر چەندە هەردووکیان یەک واتا ئەدەن ، بەڵام ( نەمەندە) لەگەڵ ( سەندە ) قافیەکە ڕەساتر ئەکا.

١٢ ـ شیعری (٢٤) پیتی ( ئەلف )

بەیتی (پێنجەم)   نەوای مەرحەبا نامان نەگۆشم

چەنی ئەلوەداش هەر نەخرۆشم

لەنوسخەی (خەسرەو )دا لە باتی (نەوا ) نوسراوە ( سەڵا ) کە ئەمە دروستە . لە پانزە ڕۆژی یەکەمی ڕەمەزاندا ( مەرحەبا .. مەرحەبا ) ئەکرێت و لە پانزەی دووەمدا ( الوداع .. الوداع ) ئەکرێ ،کە ئەمەش پێی ئەگوترێ سەڵا نەکنەوا .

۱۳ ـ شیعری ( ۲۶ ) پیتی ( ئەلف )

بەیتی چوارەم: کەی تەوانای سەبر دیارانمەن

یا پەروای تاقەت بێ یارانمەن ؟

لە نوسخەی (دۆڵاوی)دا لەباتی ( سەبر ) نوسراوە ( سەیر ) کە ئەمە دروستە . واتە : کەی توانای سەیری وڵاتانمهەیە . شایانی باسە مامۆستاش لە پەراوێزدا نوسیویە : کەی تواناو دەستەڵاتی سەیر کردنم هەیە ... هتد .

نازانم چۆن سەبریان لە بەیتەکەدا داناوە ؟

۱۴ ـ شیعری (۲۷) پیتی (ئەلف )

میسرەعی یەکەمی دوابەیتیش هەر بەحسابی جومەل ئەکاتە (۱۲۹۶) وەکومیسرەعی دووەم

۱۵ ـ شیعری (۳۲) پیتی (ئەلف )

وەڵامی ئەم دوو بەیتەی کۆماسی یەکە ئەڵێ :

ئەر بۆپروزێ وەمەڵاڵەوە

بەیۆ وەلای تۆ جەشەماڵەوە

ئانە بۆپروز سفتەی جەرگمەن

مەعلوم بۆ مەعدوم وادەی مەرگمەن

۱۶ ـ تاک بەیتی (۳۶ ) پیتی (ئەلف )

لە نوسخەی (باینچو) دا ئەبێتە شیعرێکی (۱۵) بەیتی کە لە شوێنی خۆیدا بڵاوی ئەکەینەوە.

١ ـ شیعری (٤) پیتی ( بێ ).

بەیتی نۆهەم: ئەمجار یادکەر عومر عەبەس ویەردەت
باوەر وەخاتر ناپاکیی کەردەت

لەنوسخەی (سیروس) و (شەهاب) دا لە باتی (ئەمجار) نوسراوە (جـا) کـە ئـەمە دروستە، چونکە بەو شێوە هەجایەکی زیادە.

٢ ـ شیعری (٥) پیتی (بێ).

یەکەم بەیت :

بولبول گوڵشەن بێ نام و نەنگی
تەزەرو سەرسەرو باغچەی بێ ڕەنگی

لە نوسخەی (شەهاب ) دا لە باتی ( بێ ڕەنگی ) نوسراوە ( یەک ڕەنگـی ) کـە ئـەمە دروستە . چونکە واتای وحدانیت ئەدات . مانای بەیتەکە بەم شێوەی لێ دێ : بولبولی گوڵزاری بێ ناوی و بێ باکی و ئەی تەزەروی سەردار سەروی نێو باخچەی یەکتا پەرستی .

وەلە هەمان نوسخەدا بە سەر شیعرەکەوە نوسراوە ( وقتی خانزاد خانم دختر محمد پاشا مجنونە شدە بە سر مرقد شیخ حسن مولان آبادی‌اش بردەاند . مرحوم معدوم این کلام را خدمت شیخ مرقوم فرمودەاست ).

واتە :کاتێ کە خانزاد خانمی کچی محەممەد پاشای جاف شێت بووە بردوویانە بۆ سەرگۆڕی شێخ حەسەنی مەولاناوایی . خوالێخۆشبو مەعدوم ئەم شیعرەی بۆ خزمەتی شێخ نوسیوە .

بەیتی سێیەم :

یانەی دڵ وەفەیز ڕای مەولا ناوا
تەوار تەڕلان لان (مەولان ئاوا )

لە نوسخەکانی (شەهاب) ، ( مەحزون ) ، (باینچو ) ، ( سیروس ) لە باتی (تەوار) نوسراوە(شاباز) کە ئەمە دروستە . چونکە تەوار هەڵۆی‌مێ‌یەو شیعرەکەش قسە لەگەڵ پیاودا ئەکات .کەواتە شاباز بۆ سیفەتی پیاو دروستە .

**٣ ـ شیعری (٦) پیتی (بێ).**

بەیتی یەکەم :

## بنچینەی شادیت جە دڵ بەر ئاوەرد
## جەرای مۆڵەت دوور هەرچێوت کەرد ، کەرد

لە نوسخەی (مەحزون)دا لە باتی (مۆڵەت ) نوسراوە ( مۆبەت = موحیبەت ) کە ئەمە دروستە و مانای بەیتەکە وای لێ دێ :

بنچینەی شادیت لە دڵم دەرهێنا ، ئەی یاری دوور لە خۆشەویستی هەرچیەکت کرد ، کردت .

بەیتی دووەم :

## ئیسە ئەی تاڵی و قین گرتەت پەی چێش
## ئەی تۆ بەستەی زام لابەردەت پەی چێش

لە نوسخەی (شەهاب ) دا لە باتی (گرتەت ) نوسراوە (کەردەت ) کە ئەمە دروستە . واتا کەی ئەبێتە : ئیستە ئەم ڕووگرژکردن و قین کردنەت لە چی‌یە ؟

لە بەیتەکەدا هەردوو ( پەی چێش ) ڕەدیفن ،ئەوکاتە (کەردەت ) و ( بەردەت ) ئەبنە قافیەکە جوانترو مەولەویانەترە .

وە بەیتی هەشتەمی ئەم شیعرە مەولەوی لە شیعری ( ٣ ی پیتی چ )دا دووبارەی کردۆتەوە بە شێوەی تێهەڵکێش ، شاعیر گەلێ جاری تر کاری وەهای کردووە ، هەروەکو

پێی ئەگەین

وەهەروەها ئەم شیعرە بۆ ( بولبول ) نوسراوە لە وەڵامی وەڵامەکەی داکە بۆ مەولەوی نوسیوەو مامۆستای بەڕێز لە لاپەڕە ( ١٧٧ ـ ١٧٨ )دا بڵاوی کردۆتەوە .

٤ ـ شیعری ( ١٠ ) پیتی ( بێ ) .

مامۆستا فەرمویە : مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی لەوەڵامی دوستێکیا نووسیوە .. هتد . لە هەندێ نوسخەی لای ئێمەدا ناوی ئەو دۆستەدیاری کراوە بە ( مەجذوب ) واتە کاک ئەحمەدی پریسی . مامۆستا گۆرانیش لە گۆڤاری هەولێردا ژمارە (٧) ١٩٥١ هـەروای دیاری کردووە . بەڵام لە باتی (عابا) نوسیویە (مل پێچ) کە عاباکە ڕاستەو مانای ( بەتیە ) ئەدات . هەروەها مەولەوی لە شیعرەکەدا ئەڵێ ( چون لۆنگ مەجنوون بدەوش وەکۆڵدا ) کە دیارە عابا ئەدرێ بەکۆڵدا نەک مل پێچ .

٥ ـ شیعری (١٢) پیتی ( بێ )

وشەی ( پاڕانەوە ) لە میسرەعی یەکەمدا ( بەیارانەوە )یە .

بکیانە پەیکێ بە یارانەوە
پەی کێ ؟ پەی مەجنوون بیارانەوە

واتە : نامەیەک و چەند کەسێ بنێرە . بۆکێ ؟ بۆمەجنوون کە بیهێننەوە .

پەیوەندی هونەریی نێوان ( بە یارانەوە ) و ( بـیارانـەوە ) وەکـو پـەیوەندی نـێوان (بشارانەوە ) و ( بە شارانەوە)ی بەیتی دووەم وایە .

١ ـ شیعری ( ١ ) پیتی ( پێ ).

بەیتی بەر لە دوا بەیت

چون ڕەنگ کەرۆ زام تازە زامانم
ئاومزۆ ئەودەم کۆنە زامانم

لەم بەیتەدا هەردوو ( زامانم ) ڕەدیفن و ( تازە ) و (کۆنە)ش نابنە قافیە.

لە نوسخەی (شەهاب ) ، ( باینچو ) ، ( دۆلاوی )دا ( زامانم )ی یەکەم بە ( دامانم ) ڕاست کراوەتەوە . مانای بەیتەکەش وای لێ دێ : چونکەزامە تازەکانی داوێنم ڕەنگ ئەکات ، ئەو کاتە زامە کۆنەکانم ئاویان تێ ئەزێ .

٢ - شیعری ( ٣ ) پیتی ( پێ ) .

بەیتی هەشتەم :

خان ومان خامۆش بێ تۆ ، ڕۆلەڕۆ
ئەتفالان مەدهۆش بێ تۆ ، ڕۆلەڕۆ

لەم بەیتەداواژەی ( خان و مان ) ( خانمان ) ە. واتە ژنان . بەرامبەر بە واژەی ( ئەطفالان) جوت ئەبێ . واتە ژنان خامۆش و منالان مەدهۆش ...

بەیتی دوانزەهەم :

پەی ئەو عەقل و فام هۆشیاریت ، داد
پەی خۆش نیگاری و خۆش ڕەفتاریت ، داد

لە میسرەعی دووەمی ئەم بەیتەدا ( نیگاری ) ئەبێ (گوفتاری ) بێ کە لەگەڵ واژەی (ڕەفتار )دا جوت ئەبن . گوفتار و ڕەفتار واتە قسەوکردەوە .

٣ ـ شیعری ( ٤ ) پیتی ( پێ ) .

دوا بەیتی ئەم شیعرە هی ( داخی )یەو مەولەوی تێهەڵکێشی کردووە . پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ .

٤ ـ شیعری ( ٥ ) پیتی ( پێ ) .

بەیتی نۆیەم :

موتریب ، بۆ وەداد دڵگیریمەوە

پیری ها ئاما وە پیریمەوە

مەولەوی سوژێتی ئەم بەیتەی لە خانای قوبادی وەرگرتووەکە ئەڵێ :

پیری ها ئاما وەپیریمەوە.

ئیتر نیم وەتەنگ زویریمەوە ( شیعری پەی سەنەو ساڵم ... )

خاناش لە بەیتێکی فۆلکلوری لەکی وەرگرتوە کە ئەڵێ :

پیری هاتیە وەپیریمەوە

وەی دلەی خەمین دلگیریمەوە.

٥ ـ شیعری ( ٦ ) پیتی ( پێ ).

بە پێی نوسخەی (باینچو) بەیتی یەکەمی ئەم شیعرە پەڕیوە. وەها دەست پێدەکات.

خاڵۆ ویەردەن .....

هیجرانت یەکجار جە حەد ویەردەن.

بەیتی یەکەمی دیوانەکە

پەژارەت شادیم جە بێخ ئاوەردەن

دووریت ڕیشەی دڵ خەیمەکەن کەردەن

میسرەعی دووەمی ئەبێتە :

دووریت خەیمەی دڵ ڕیشە کەن کەردەن.

واتە : دووریت خێمەی دڵی لە ڕیشە دەرهێنا.

بەیتی سێیەمی دیوانەکە :

وەسواسەت وەی تەور ئێش دان وەجەرگم

وەمەرگت قەسەم ڕازیم وەمەرگم

بە پێی نوسخەی ( میم ) لە باتی ( ئێش ) نوسراوە ( نێش ) کە ئەمە گونجاوترە. واتە : وەسواسەت بە جۆرێ چزی داڵە جەرگم.

بەیتی چوارەمی دیوانەکە :

وێت بدەر ئینساف نەونەمام نۆ

مەردەن خاستەرەن یاخۆ دووریی تۆ

لە نوسخەی ( میم )دا لە باتی ( نەونەمام نۆ ) نوسراوە ( خاڵۆکەی خۆش خۆ ) . کە ئەمە دروستە چونکە شیعرەکە بۆ خاڵۆی کۆماسی نوسراوە ، ئەویش بە شیعری ( چراغم جەی ڕۆ ) وەڵامی داوەتەوە کە پاشان شیعرەکەی خاڵۆ بڵاو ئەکەینەوە.

دوابەیت :

دەک ڕەحمەت ئەو قەبر گشت وەفاداران

خسوسەن ئەو کەس شای وەفاداران

لە نوسخەی (باینچو)دا بەم شێوەیە :

دەک ڕەحمەت ئەو قەور گرد سینە سافان

خسوسەن یەعقوب میرەکەی جافان.

( میرزا یەعقوبی جاف شاعیرێکی باش نەناسراوی ئەو دەورەیە ، لەوە ئەچێ

مەولەوی بەیتی لێ هێنابێ بۆ تێهەڵکێشی شیعرەکەی ) . پاشان هەربە پێی ئـەم نوسخەیەو نوسخەی ( شەوکەت یاریان ) شیعرەکە بەم شێوە درێژەی هەیە :

چەرخی چەپ چەنیم ڕاس بەستەن کەڵەک
مەرمن سەنگم دان وەمینای فەلەک

دایم پەریۆ من هاجە بەهانە
گاهێ ( ئەصفەهان ) گاهێ جە ( بانە )

نمەدۆم فرسەت ساتێ وەبێ خەم
گەرد پاڵاکەت بماڵوون وەچەم

یا شەوێ شین کەم جە شەو ناڵینت
یارۆیێ ڕۆکەم وەزاری و شینت

یاناڵەم چەنی ناڵەت بخێزۆ
یادیدەم ئەسرین پەرێت برێزۆ

یا شەمەی جە شەرح دووریی دووبارە
داخ هیجرو وەسڵ دڵەی سەدپارە

عیشوەو گریشمەی حووری جەمین گوڵ
عەرز کەم وەپابۆس پەی تەسکین دڵ

چەپگەرد نمازۆم دەمێ فەراقەت
ساخوا یا وەسڵ ، یا مەرگ ، یا تاقەت . [1]

شیعرەکەی کۆماسی :

چراغم جەی ڕۆ ...
من جە ڕۆی ئەزەل مەتەرسام جەی ڕۆ

مەزانام گەردش ئەی چەرخ بێ پۆ
مە کەرۆم مەحروم جەدیداری تۆ

ڕۆی وەسڵت هەربیم ئەی ڕوە پێم بی
جەو بۆنە هەر ڕۆ ڕۆڕۆ خدێم بی

هافەڵەک ئەورۆ نیشان دادەن پێم
دەک وەتەرساکەی گیرئاوەردەوێم

ئیسە کێ تاقەت دووریی تۆ دارۆ
دەک بەرقی غەزەب وەبەختم وارۆ

---

١ - کاک محەممەد عەلی قەرەداغیش لە گۆڤاری کۆڕی ژمارە (٦) بڵاوی کردۆتەوە . هەندێ جیاوازی لە گەڵ ئێمەدا هەیە.

چێشەن ئەی عومرەی تاڵ تەر جەژارە
ئەی ئەعزای بێ سەرف مەینەتان بارە

چونکە کۆچمەن جەدیداری تۆ
هەریەک وەدەردێ باگرفتار بۆ

دیدەی نەوینۆ هەر سەحەر دیدەت
نەدیۆ وەخاڵان قودرەت ڕەژیدەت

ئەو دیدە وەنێش نەشتەر کنیابۆ
دیانش وێنەی زوڵفی سیابۆ

زووانێ چەنیت هەرشەو نەبۆباس
فەرەق فەرەق بۆ چون سفتەی پەڵاس

دەستیۆ جەم نەجێت جەیر ئاسات نەبۆ
گاگا شانەی زوڵف تاوەتات نەبۆ

ئەو دەستە گەستەی ماری پر ژار بۆ
وەگازی ماران لەتار لەتار بۆ

گۆشێ نەشنەوۆ ڕێزەی رازەکەت
ئەو چفەی وەنەرم دڵنەوازەکەت

هەرپەی ئید خاسەن ئەترەش بۆ دەربەس
بادانەشنەوۆ هەرگیز دەنگی کەس

وەلحاسڵ ژیان بێ دیداری تۆ
بەدتەرەن جەمەرگ نەونەمامی نۆ

( ئەحمەد ) ئومێدش بەدانای داوەر
یا تاقەت ، یا مەرگ ، یا وەسڵی دڵبەر

١ ـ شیعری ( ١ ) پیتی ( تێ ).

بەیتی شانزەهەم :

شێوە ئەر ئیدەن من کەردەنم سەیر
فام ، خوداحافیز ، دین ، بنیش وەخەیر

شێوە وەرگێڕانێکی ئەم بەیتەی ( خجندی ) شاعیری فارسەکە ئەڵێ :

گر که چشم اینست و ابرو این و ناز این و عیشوه این
الوداع ای زهد وتقوی الفراق ای عقل ودین

مەولەوی خۆیشی هەر بە وەرگرتن لەم بەیتە فارسیەی داناوە بۆیە کردویەتی بە پەراوێزی قەسیدەکەی وئەڵێ :

جەو بۆنۆ فەردم ئیستیفا بێزەن
دامەنەش لایق ئەی پەراوێزەن

٢ ـ شیعری ( ۴ ) پیتی ( تێ ).

بەیتی دووەم :

سەنگیی سەنگی بار تاوان زۆر کەردەن
پیری بەد نامەن قامەت خەم کەردەن

قافیەی ئەم بەیتە تەواو نیە. هەردوو (کەردەن) ڕەدیفن. ( زۆر ) و ( خەم )یش نابنە قافیە. بە پێی نوسخەی ( میراث )، (کەردەن)ی دووەم بۆتە ( وەردەن ) واتە : باڵا خەم وپێچی خواردووە. ئەمە دروستە.

دوو بەیتی کۆتایی ئەم قەسیدەیە، مەولەوی لە قەسیدەی ( ٨ )ی پیتی ( دال ) هێناویەتی وتێهەڵکێشی کردووە.

١ ـ شیعری ( ١ ) پیتی ( جیم ).

بە پێی نوسخەی ( شەهاب )، ( باینچو )، ( میراث ) لە نێوان بەیتی یانزەو دوانزەدا ئەم بەیتە هەیە :

ئەو تەنیای غەریو قامەت وەخەم خەم
تۆ وەسەیر ماردوم هام دەمی کەڵڕەم.

١ ـ شیعری ( ١ ) پیتی ( چیم ).

بەیتی سێیەم :

بێ دەس بێ چنار زیز خاتر ڕێش
بەڵ خاکێش کەرۆ وەسەردا پەی وێش

لە نوسخەی ( شەهاب )، ( باینچو )، ( مەحزون )، ( سیروس )، ( میراث ) لە باتی (کەرۆ)

نوسراوه (کەردا) کە ئەمەیان دروستەو مەولەویانەیە ، چونکە لە نێوان (کەردا ) و ( سەردا)
شێوە جیناسێ دروست ئەبێ .

بەیتی یانزەهەم :

قازان چون یاران ئاواتە خوازان
قەتارە بەستەن مەکەران ڕازان

لە نوسخەی ( میم ) ، ( شەوکەت یاریان )دا لە باتی ( یاران ) نوسراوە ( بازان ) .
کەبازیش کینایەیە لەیار ، بەڵام جوانیی بەیتەکە لەوەدایە کە جۆرێ جیناس و هەم
مۆسیقایەک لە نێوان ( قازان ) و ( بازان ) و ( خوازان ) و ( ڕازان )دا دروست ئەبێ ، کە ئەمە
مەولەویانەیە .

بەیتی دوانزەهەم :

بێ لەیل ، ئاخ ، ئامێ جەئێلاخەوە ... هتد

لە نوسخەی ( شەهاب ) ، ( مەحزون ) ، ( سیروس ) ، ( میراث )دا نوسراوە : ئامای جە
لەیلاخەوە. کە ئەمەیان دروستە چونکە ( لەیلاخ ) واتە کوێستان . هەرچی شیعرەکەشە وا
دیاری کراوە کە مەولەوی بۆ دۆستێکی جافی ناردووە کە لە کوێستان ماوەتەوە . ئەمە
گونجاوترە چونکە ( ئیلاخ ) واتە گەرمەسێر .

وەلەنێوان بەیتی ( ٢٦ ) و ( ٢٧ )دا بەپێی نوسخەی ( شەهاب ) و ( شەوکەت یاریان ) ، (
سیروس ) ، (دۆڵاوی ) ئەم بەیتە هەیە :

زوسان پای هەردان ئێڵاخان سەردەن
لازمەن هەوای گەرمەسێر کەردەن

وەبە پێی نوسخەی ( شەهاب ) ، ( شەوکەت یاریان ) ، ( مەحزون ) شیعرەکە بەم بەیتە

کۆتایی دێ :

**بازە لەیلاخان ئامان سەد ئامان**

**وەخەیر تەشریفت باوەر وەلامان .**

**٢ ـ شیعری ( ٢ ) پیتی ( چیم ) .**

بەیتی سێیەم :

**ئێش هام فەردم ئێش وێم زانان**

**دەرد هام دەردم دەرد وێم زانان .**

ئەم بەیتە قافیەی دروست نیە . هەردوو ( وێم زانان ) ئەبنە ڕەدیف . کەواتە ( ئێش ) و (دەرد) نابنە قافیە . دروستەکەی ئەوەیە بگوترێ :

**فەرد هام فەردم فەرد وێم زانان.**

واتە : شیعری هاو شیعرەکەم بە شیعری خۆم زانی .

نمونەی ئەمەش هەر لە شیعری خودی مەولەویدا هەیە . بڕوانە قەسیدەی‌یەکی پیتی دال . کە لە بەیتی دوانزەدا ئەڵێ :

**گا تێکەڵ مەکەرد چەنی دەرد وێش**

**فەرد هام فەردش چەنی فەرد وێش**

بەم شێوە ( فەرد ) و ( دەرد ) ئەبنە قافیە .

بەیتی هەشتەم :

**من ڕۆی مامەڵەی گردین خاص و کەس**

**جەوڕاسە بازاڕ شارەکەی ئەلەس .**

به پێی نوسخەی ( خەسرەو ) ، ( دۆڵاوی ) له باتی ( خاص و کەس ) نوسراوه (خاس‌وگەس) به واتای چاک و خراپ . نەک بەواتای ئەوەی که مامۆستای بەڕێز لێکی داوەتەوە .

بەیتی پانزەهەم

ئەرهەرسات دەردێ دەرێو تەرچەنی
بەیۆ ماچوو ئاخ پەی دەردێ هەنی .

دووبارەکردنەوەی بەیتی هەشتەمی قەسیدەی شەشەمی پیتی ( ب ) ە

بەیتی سیانزە :

مەرچون تۆ هەڵوای مەحەبەت خامی
قەبای عەشق دڵ پشت ناتەمامی

له نوسخەی ( خەسرەو ) و ( دۆڵاوی )دا له باتی ( هەڵوای ) نوسراوه ( هەوای ) که ئەمه دروسته به واتای ئارەزوو ...

**٣ ـ شیعری ( ٥ ) پیتی ( چیم ) .**

موناسەبەتی ئەم شیعره لای مامۆستای بەڕێز وا دیاری کراوه : مەولەوی بەم قەسیدەیه تەعریفی نازارێکی جاف ئەکاکه لەو دیوی دەوارەوه خۆی دەرخستووه .

له هەندێ نوسخەی لای ئێمەدا وادیاری کراوه که شیعرەکه بۆ مەهـ چهره خانمی ژنی والی سنه نوسراوه مەولەوی شیعری ( ٥ ) پیتی ( خێ ) و شیعری ( ٢٥ ) ی پیتی ( دال ) یشی هەر بۆ ئەم ئافرەته نوسیوه .

بەیتی :

باوەشێن مەکەرد ئەو سەفحەی بێگەرد
نازکیش جەباد ئیحتیات مەکەرد

له هەردوو شیعرەکەدا بڵاوکراوەتەوە.

وەهەروەها وشەی ( چهرە ) لە هەر سێکیاندا هەیە .کە حەتمەن ئاماژەیە بۆ مەهـ چهرە خانم ،.

مەولەوی زۆرجار کە شیعری بۆ کەسێ نوسیبێ هەوڵی داوە بە شێوەیەکی هونەریی ناوی ببات . بۆ نمونە بڕوانە شیعری ( ٢ )ی پیتی ( لام ) کە بۆ مەلا ( یونسی لوقمەماسی ) نوسیوە . لوقمە ماسی گوندە . یا شیعری ( ٣ )ی پیتی ( تێ ) کە بۆ مەلاعەبدولڕەحیمی نەجاری نوسیووە .. هتد .

٤ ـ شیعری ( ٦ ) پیتی ( چیم ) .

بەیتی یەکەم:

چەمان هەم قامەت کەیفم خەمبارەن
زەردی نەڕووی دڵ زەوقم دیارەن

وەک مامۆستا خۆیشی ئاماژەی پێ کردووە ، لە نوسخەکانی لای ئێمەش دا لە باتی (چەمان) ، ( چمان) نوسراوە ، هەرچەندە بە ئیملای عـەرەبی هـەردووکیان وەک یـەک ئەنوسرێن ، بەڵام نوسخەی ( خەسرەو ) لە پاڵیا نوسیویە (کأنه ) . نوسخەی ( دۆڵاوی )ش سکـونێکی لـەسـەر داناوە بـۆ ئـەوەی بـە ( چـمان ) بـخوێنرێتەوە. وەنـوسخەی (شەوکەت یاریان) لە میسرەعی دووەمدا لە باتی (دڵ) (وەڵگی) داناوە کە ئەمە دروستە . واتە: زەردیی بە ڕووی گەڵای زەوقمەوە دیارە .

بەیتی دووەم :

تەوق خەم گەردەن شەوقەکەم بەستەن
کەف پای شادیم خار تێ شکستەن

لەم بەیتەدا بۆ جوانتر بوونی قافیەکە ( شکەستەن ) دروستە . واتە بە ئیملای کوردی بە

شێوە فارسیەکەی بنوسرێ . ئەم واژەو واژەی ( نەم ) کە بە ( نم ) نوسراوە لە تەواوی بەیتەکاندا قافیەکان نارەسا ئەکەن . پێویستە بەو شێوەیان لێ بکرێ کە ئێمە نوسیمانن .

١ ـ شیعری ( ٢ ) پیتی ( خێ ) .

مامۆستا نوسیویە : مەولەوی ئەم غەزەلەی بۆ برادەرێکی نووسیوە . لای ئێمە ڕوون بویەوە کە ئەو برادەرە (صەرعی)یەو ئەمیش بە شیعری ( دڵم جە ئۆف ئۆف زامەتان شەیدان ) وەڵامی داوەتەوە . ئەمەش شیعرەکەیە :

دڵم جە ئۆف ئۆف زامەتان شەیدان
دەردم دەردێوەن دەواش ناپەیدان

ئەو جارە کەسێ مەوات ئای دەردم
تانە مەدام لێش ، مەناش مەکەردم

ئیسە ئەوەند دەرد جە لام بیەن جەم
خودا تەوبە بۆ مەنای کەس نەکەم

های چێشەن یاران دڵ تەم کەردەوە
ئاسمانەی چەم هۆر ئاوەردەوە ؟

شاخەو شریخەی لاسامەو تۆفە
خالق سا ڕەحمێ دیسان ئۆف ئۆفە

شاخەو شریخەی لاسامەی بارە
بەرق و بزیسکەی شۆڵەی شەرارە

کای دڵم نەبەین گێجی فەنادا
مۆلەقەن نە بەین خەوف و ڕەجادا[1]

داخۆم هەم وەغەم قامەت هیلال بۆ ؟
یا نەغمەی ناجەی دووریی جەلال بۆ

نەی تەشویش ناگاه قاسید جە لاوە
چون پەیکی نەسیم جە سوب سەلاوە

خەرامیاو ئاما نە سەردا مەس مەس
نامەی وەش مەزمون تۆم سپەرد وەدەس
چون ئاوات وازان خەیلێ بۆسیام
تەنخوای بینایی وە چەمان نیام

نامەی سەد شکەن شکیابی وە هەم
خامە دوی سیاش سەرماما نەدەم

دەوات دەرونش نە تەلاتومدا
لیقەوێش کێشان وەلیتەی خوم دا

مەعلوم بی هەردوو دەلالەت مەکەرد
ئید جە خەستەگیت ، ئەو جە ئاهی سەرد

---

١ - ئەم بەیتە تێهەڵکێش کراوی مەولەوی یە  کای دڵم نە گێج مەوج فەنادا
مۆلەقەن نە بەین خەوف و ڕەجادا .( ل ٢٦ )

